## پێرست



**ژمارەکانی داهاتوومان تایبەتە بە هەریەک لە:**

بەدیع باباجان ( هونەرمەند )
عەبدوڵلا جەوهەر (نووسەر)
شوکر مستەفا (نووسەر ، وەرگێڕ)
پیربال مەحموود ( شاعیر )


سەرپەرشتیاری گشتی: دلشاد عەبدوللا
ستافی رۆڤار: یاسین عومەر / سەباح رەنجدەر
هەڵەچن: نەورۆز حاجی سەید گوڵ
دەرهێنەری هونەری: حەمید ئازمووده
فۆتۆ: رۆستەم ئاغاله
رۆڤار: بلاوکراوەیەکی رۆشنبیرییە/ هەر ژمارە تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای ئاراس و سەردەم وەکوو پرۆژەی هاوبەش دوومانگ جارێک دەری ئەکەن


ناونیشان: هەولێر -شەقامی گوڵان-دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
سلێمانی -شەقامی سالم -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن سەرپەرشتیاری گشتی :
کۆرەک: ٠٧٥٠٤٥١٢٧٨٦ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٣٢١٤٥
Email:d.abdullah@araspress.com

گۆران. یاخود عەبدوڵڵا بەگ کوڕی سلێمان بەگی کوڕی عەبدوڵڵا بەگە، باوکیشیو باپیریشی لە شیعرو ئەدەبدا بەهرەیان بووەو بە کوردیو بەفارسی نووسیویانەو شیعریان وتووە، بەتایبەتی عەبدوڵڵا بەگی باپیری. کە گۆرانی بەناوەوە ناونراوە. لە زمانو ئەدەبی فارسیدا دەستێکی درێژی بووەو هەر بۆیەش بە(کاتبی فارسی) ناوبراوە.

گۆران لە ١٩٠٤ یا لە ١٩٠٥دا لە هەڵەبجە لەدایک بووە، بنەماڵەی باپیری لە بەگزادەی (میران بەگی) بوون لە ناوچەی (مەریوان)و عینایەتوڵڵا بەگی کوڕی ئەمانوڵڵا بەگیان بەخۆیو خێزانیەوە دێتە سلێمانیو لە ناوچەی قەرەداغ ماوەیەک دائەنیشێ، زۆری پێ ناچێ کۆچی دوایی ئەکا. عەبدوڵڵا بەگی کوڕی (باپیری گۆران) لەگەڵ هەموو خێزانەکەیاندا کە لە برایەکی بچووکیو دایکیو ژنەکەیو منداڵەکانی خۆی پێکهاتووە ڕوو ئەکەنە هەڵەبجە، چونکە خۆیان بەچاک زانیوەو لەوێ جێگیر ئەبن. لەو سەفەرەدا دایکی عەبدوڵڵا بەگو برایەکی بە(سێ بەرۆ) ئەمرنو ئەمێننەوە عەبدوڵڵا بەگو منداڵەکانی خۆی کەئەمانە بوون: مستەفا بەگ، نووری بەگ، نەفێ خان، سلێمان بەگ، حەبیبە خان. لەمانە نەفێ خان شوو ئەکا بە مەجید بەگی عوسمان پاشا. حەبیبە خانیش شوو ئەوکا بە یەکێ لە شێخانی خانەگای لای پاوە. مستەفا بەگو نووری بەگیش کەسیان لە پاش بەجێ نامێنێ. بەڵام سلێمان بەگ ئەم منداڵانەی ئەبێ: عەلی، شەمسە، محەمەد، عەبدوڵڵا، عەلیو شەمسە بەلاوی مردوون. محەمەدیش کە مەشهوور بووە بە(حەمە بەگە ڕووشە) پاش مردنی باوکی بەدوو ساڵ ئەکوژرێ، بەم چەشنە لەم بنەماڵەیە هەر عەبدوڵڵا (ی گۆرانی دوارۆژ) ئەمێنێتەوە.

گۆران لای باوکی قورئانو سەرەتای خوێندنی خوێندووە، پاشانیش لە (مزگەوتی پاشا)ی هەڵەبجە بووە بەفەقێ تەنانەت ماوەیەکیش بە(فەقێ عەبدوڵڵا) ناسراوە.

لە دوا ساڵەکانی جەنگی یەکەمو سەرەتای هاتنی ئینگلیزدا، بۆ ماوەیەک هەڵەبجە چۆڵ ئەبێتو خەڵک ڕوو ئەکەنە لادێکانی دەوروپشت. ماڵی باوکی گۆرانیش لە بەهاری ١٩١٩ەوە تا پاییزی ئەو ساڵە ڕوو ئەکەنە چەمی بیارەو لەوێ لە باخێکدا هەوار ئەخەنو بۆ پاییز ئەوسا ئەگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە.

«گۆران خۆی بۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمی گێڕاوەتەوە، وتوویە: (لەبیرمە کە یەکەم قوتابخانەی زەمانی تورک لە هەڵەبجە دانرا، بۆ پۆلی یەکەم وەرگیرام. بۆ پۆلێک وەرگیرام کە مووەدیرەکەمان، [illegible] بێ، تاهیر ئەفەندیی مەلا ئەمینی جەففار پێی ئەوت پۆلی ئیحتیات)، وەک گۆران خۆی گێڕاویەتەوە دەوامی لە قوتابخانەی ڕەسمیشدا پچڕ پچڕ بووە، پۆلی چوارەمی لە سەردەمی داگیرکردنی هەڵەبجەدا لەلایەن ئینگلیزەوە- تەواوکردووە.

هەر لە ١٩١٩دا سلێمان بەگی باوکی گۆران کۆچی دوایی ئەکات. پاشان لە ١٩٢١دا محەمەد بەگی برای، بەهاندانی مستەفا سائیب، لەگەڵ عەبدولواحید نووری خاڵۆزایدا ئەیاننێرن بۆ قوتابخانەی عیلمییەی کەرکووک بۆ خوێندن. بەڵام هەر لەو ساڵەدا محەمەد بەگی برایشی ئەکوژرێ. ئیتر گۆران کەسی وای نامێنێ کوژمەرانی خوێندنی خۆیو ژیانی دایکی ببا بەڕێوە، لەبەرئەوە دەست لە خوێندن هەڵئەگرێو لە ساڵی ١٩٢٢ەوە تا ساڵی ١٩٢٥ گەلێ دەست تەنگی ئەچێژێ.

گۆران بۆ یەکەمجار لە ١٩٢٥دا بە مامۆستایی لە قوتابخانەی هەڵەبجە دامەزراوە تا ١٩٣٧ لە قوتابخانەکانی ئەو ناوچەیەدا ماوەتەوە. پاشان گوێزراوەتەوە بۆ ئەشغال- بەشی کاروباری ڕێگاوبانو تا گیرانی یەکەمی لە ١٩٥١دا، جگە لەو چەند ساڵەی کە لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی تری کورددا لە خەباتدا لەدژی فاشیزم بەشی کوردستان ئەکەنەوە، لە ئەشغالدا ئەمێنێتەوە.

١٩٣٢ هیوای کوڕی لە دایک دەبێ و لە ١٩٣٣ دەمرێ و ١٩٣٤ هۆگری کوڕی و ١٩٣٦ ئەژی لە دایک دەبێ و ١٩٤٧ هێرۆی کچی لە دایک دەبێ .

ساڵی ١٩٤٣ " گەشتی هەورامان " لە کتێبی " خوێندەواری باو " ی تۆفیق وەهبیدا بە پیتی لاتینی بڵاوبۆتەوە .

لە تشرینی دووهەمی ١٩٥٢دا لە بەندیخانەی یەکەمی دێتەدەرو ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانیو ئەبێ بە بەرپرسی ڕۆژنامەی (ژین)، تا ئەیلوولی ١٩٥٤ لەسەر ئەم کارە ئەمێنێتەوە، لە ١٩٥٤/١٠/١٧دا بۆ جاری دووهەم لەگەڵ کۆمەڵێ لە ئاشتی خوازانی سلێمانی ئەگیرێو حوکمی ساڵێ بەندو ساڵێ خستنە ژێر چاودێریی پۆلیسی بەسەردا ئەدرێ. ماوەی حەپسەکەی لە سلێمانیو کەرکووکو کوتو بەعقوبەو نوکرەسەلمانو ماوەی چاودێرییەکەشی لە بەدرە بەسەر ئەبا.

لە ١٩٥٦/٩/١٢دا ئەم حوکمەی تەواو ئەکاو بەرئەبێو ئەچێتە بەغدا چەند ڕۆژێک لەوێ لە یەکێ لە پرۆژە حکومەتییەکانی بینادا ئەبێ بەچاوەش عەمەلە. زۆری پێ ناچێ دیسانەوە لە هێرشی میریدا بۆ سەر نیشتمان پەروەران بەبۆنەی دەستدرێژییە سێنفۆلییەکەی سەر میسرەوە، ئەگیرێتەوەو لە ١٩٥٦/١١/١٧دا دادگای عورفی لە کەرکووک حوکمی یا سێ ساڵ بەندی یا بەبارمتە دانانی هەزار دیناری ئەختێ ئەدا کە تاسێ ساڵ ورتەی وای لە دەم دەرنەیەتو کردەوەی لێ نەوەشێتەوە میری پێی دڵگران بێ. گۆران نە هەزار دینارەکەی ئەبێو نە ئەشیەوێ گفتی وا بە میری بدا، بۆیە ئەخرێتەوە بەندیخانەو تا ١٩٥٨/٨/١٠ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی پیرۆزی ١٤ی تەمموز تیا ئەهێڵرێتەوە. گۆران ئەم ماوەیەی لە بەندیخانەی کەرکووکو بەعقوبە بەسەربردووە.

ساڵی ١٩٥٧ س . ح . ئیدمۆنس گەشتی هەورامانی جارێکی تر بە پیتی لاتینی بڵاوکردۆتەوە لە بەرانبەر هەر پەرەگرافێکیش وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەشی بڵاوکردۆتەوە لە کتێبی ( کورد ، تورک ، عەرەب ) چاپی ئۆکسفۆردا لەندەن .

پاش بەربوونی لە زیندان ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانیو پاش ئەوە بە ماوەیەک لەگەڵ وەفدێکی میللی سەر لە یەکێتی سۆڤیەتو چینی میللیو کۆریای دیموکراتی ئەدا.

لە سەرەتای ١٩٥٩دا سەرپەرشتیی گۆڤاری (شەفەق) ئەگرێتە دەستو بەناوی (بەیان) دەری ئەکا. لە نیسکانی سلێمانیش

دائەمەزرێ‌و تا ناوەڕاستی ١٩٦٠ کاری تیا ئەکا. ئەنجا بەبیانووی ئەوەوە کە گوایە بێ پرس کاری بەجێهێشتووە (کار بەجێهێشتنەکەی بۆ چوون بووە بۆ شەقڵاوە بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەی دووهەمی مامۆستایانی کورددا) لەسەر کار لای ئەبەن.
لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٠دا دێتە بەغداو ئەبێ بە موحازەرەدەر لە بەشی کوردیی کولییەی ئادابی زانکۆی بەغداو بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی ئازادی.
لەسەرەتای ١٩٦٢دا ژانەسک زۆری پێ ئەهێنێ. دەرئەکەوێ کە گەدەی تووشی نەخۆشیی (شێرپەنجە) بووە، عەمەلیاتێکی سەرکەوتووی لە بەغدا بۆ ئەکرێ، بەڵام بەداخەوە پاش وادە.
×پاش ئەو عەمەلیتە لە نیساندا ئەچێ بۆ مۆسکۆو سێ مانگێک لە نەخۆشخانەی (کرێملین)و سەنەتۆریی (بەرڤیخە) بەسەر ئەباو پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ عیراق.
پاش گەڕانەوەی بەماوەیەکی کەم نەخۆشییەکەی سەر هەڵئەداتەوەو تەنگی پێ هەڵئەچنێ. لەبەرئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی‌و لەوێ لە جێدا ئەکەوێ.
×لەسەعات نۆو نیوی سبەینێ ١٩٦٢/١١/١٨دا چاوی یەگجاری ئەنێتەوە.



گۆران -ڕەفیق چالاک: یافا

بەرهەمە چاپکراوەکانی :

١. بەهەشت و یادگار ، ١٩٥٠ هەولێر .
٢. فرمێسک و هونەر ، لەگەڵ دوو هاوینە گەشت ، چاپخانەی مەعاریف ١٩٥٠ بەغدا.
٣. سروشت و دەروون .
٤.لاوک و پەیام . ١٩٥١ . هەولێر .
٥. لە کۆڕی خەباتا .
٦. نۆپەرێت .
٧. پییەس لە یەک پەردەی کورتا .
٨. شیعری گەپ .
٩. سروود .
١٠. شیعر بۆ منداڵان .
١١. هەڵبژاردە لە چیرۆکی کورتی بێگانە ١٩٥٣ .
١٢. بۆ زاخاوی مێشک .
١٣. کۆمەڵە شیعرێکی لە زمانی بێگانەوە کردۆتە کوردی .

ڕەفیق حیلیمی لە بەرگی دووەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا دەربارەی گۆران دەڵێ : گۆران شاعیرێکی فەننان و واقعییە ، مادەی شیعرەکانی لە کانگای ژیانی کۆمەڵایەتی هەڵێنجاوە کردووەیە بە دەقی ئەدەبدا و ئینجا لەم وێنە سیحراویی دڵڕفێنی شیعریدا هێناویەتی دەرێ . ئەو لاسایی بۆیژە کۆنەکانی نەکردووە ، خۆی ڕێگەیەکی تازەی وای داناوە کە ئەشێ بوێژو ئەدیبە تازەکانمان لاسایی بکەنەوە. ئەو تەقلیدی سەرەوژێر کردووە و قافیەی ملکەچی خۆی کردووە .

کاکەی فەللاح لە کتێبی کاروانی شیعری نوێی کوردی دەقە پەخشانێکی گۆرانی بڵاوکردۆتەوە بە ناوی ( ئەسەفی مازی و ئەندێشەی ئیستیقبالم ) لە ژمارە ٦١ ی ڕۆژنامەی پێشکەوتنی ساڵی ١٩٢١ بە ناوی ( شاگردی مەکتەبی هەڵەبجە . لە هۆزی کاتب فارسی . عەبدوڵڵا سەبری ) و نووسیوویەتی : ئاخ مردن ! ئاخ مردن بۆ ناتگەمێ ؟

لە چاوپێکەوتنێکدا کە " محەمەدی مەلا کەریم " و " عەبدولرەزاق بیمار " لەگەڵ گۆراندا کردوویانە ، گۆران سەبارەت بە شیعری تازەی کوردییەوە دەڵێ : نووسەر و شاعیرانی ئەوسا بە تایبەتی شێخ نووری و ڕەشید نەجیب و من کە پێکەوە بە ئەدەبی تورکی متەئسیربووین و پێکەوە دەماننووسی .

کە وابوو هەموو پێکەوە دەمانڕوانییە یەک کلاوڕۆژنە ، بەڵام دەتوانرێ بە شێخ نووری بووترێ سەرۆک ، بە هۆی زۆری بەرهەمی بڵاوکردنەوەیان . من تەنها بە کۆششی ئەوان ئەوەستام و وەزنی هیجاشم وەرگرت و بەکارهێنا . لەم بابەتەوە ڕەنگبێ ڕەفیق حیلمیش پێش ( نووری )کەوتۆتەوە .

( ئەوڕەحمان بەگی نفووس )یش لە سەرەتای ژیانی شاعیریتیدا زۆر بە گوڕ دەستی دایە تازە کردنەوەی هەڵبەست و لە ( نووری ) کۆنترە .

بەڵام ئەو شیعرەکانی بڵاونەدەکردەوە .

پاش ئەم ماوەیە کە سەرمەستی ئەدەبی تورکی و فارسی بووە ، دواتر ئەدەبی تازەی عەرەب ، ئەدەبی ئینگلیزی خوێندۆتەوە .

د . کامل بەسیر لە گۆڤاری ڕۆژی نوێی ژمارە ( ٨ ) ساڵی ١٩٦٠ دەربارەی گۆران نووسیوویەتی : بیروباوەڕی مرۆڤایەتی وەک کەرەسەی هەوێن یەکەمجار لە ئەدەبی نوێی کوردییدا ( گۆران ) بە لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازا وەک نۆبەرە دەستی پێکرد .

× لە مۆسکۆوە نامەیەک دەنێرێ و دەنووسێ : تازە چۆن دڵ بە ژیانی خۆم خۆش بکەم بە دەست ورگێکەوە کە لە چوار بەش سێ بەشی جەلاتین بێت . زۆرتان پێ وتم تا خۆم لە ژیاندام شیعرەکانم چاپ بکەم ، بەڵام نەمکرد ، بۆم هەڵنەسووڕا . ئێستا پەشیمانم ، بەڵام لە پاش چ .

سەرچاوە:

١.شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم-ڕەفیق حلمی.
٢.بەسەرهات و شوێنەواری مامۆستا گۆران . . تاران . . هیوا ( دکتۆر ئەمین حەسەن پوور ) حەوتەنامەی " کوردستان " ژمارە ٤٣ .
٣. گۆڤاری بەیان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٧١ .
٤. کاروانی شیعری نوێی کوردی . . کاکەی فەللاح
٥. سەرجەمی بەرهەمەکانی گۆران بەرگی یەکەم. دیوانی گۆران ١٩٨٠ (کۆکردنەوە و ئامادە کردنی محەمەدی مەلاکەریم)



گۆران - لە تەمەنی بیست و یەک ساڵیدا

# گوڵێکی نەوشکفتەی شیعر

چەند ساڵێک لەمەوبەر خۆشبەختانە ڕێم کەوتە شارێکی لەتیفی کوردستان. موددەتێکی موناسب لەوێ مامەوە. حەیاتێکی سادەو زەریف، حەیاتێکی پڕ لە شیعرو سونوحاتم ڕابوارد. ئەتوانم بڵێم ئەم شارە بە دەشتو دەری شاعیرانەوە، بە شاخو نزاری پڕ لە ئەحلامو خەیاڵاتیەوە لانەیەکی ئەزەلیو ئەبەدی شیعرە، زەڕاتی هەوای پڕ لە ئیلهامە. تاریکەشەو و مانگەشەوی موتەساوییەن شاعیرانەو وەحی بەخشە. بن هەر لقی داری باغێکی لەد فریشتەو چەند پەریی شیعری لێیەو هەر بەم سەبەبەوەیە لە ڕۆژێکەوە بناغەی نراوە بێ شیعرو شاعیر نەبووە.

ئا لەم شارەدا ئەوەل ڕۆژی موالەلەتم لاوێکی زیرەک و تێگەیشتوو، ڕەقیق‌و فەقەت مەحجووب جەلبی دیقەتی کردم. ئیفراتی مەحجوبیەتەکەی تەقریبەن کردبووی بە مەردوم گوریز. غالیبەن گۆشەیەکی ئینزیوای پڕ حسس‌و خەیاڵی تەرجیح ئەکرد بەسەر حەیاتێکی پڕ جۆش‌و خرۆشی ناو خەڵقدا.
موعارەفەمان بۆ موددەتێکی مەدید عیبارەت بوو لە چەند مولاقاتێک، فەقەت بەرەبەرە مولاقاتەکەمان تەزایودی کرد، ئاشنایێکی موتەقابیل هاتە وجود-ئاشنایێکی فکرو حیسی قەناعەتی کامیلم بۆ حاڵ بوو کە دوور لە ژێر پەردەی کەسیفی مەحجوبییەتەکەیدا حیسێکی ڕەقیق‌و بەرز، تەبیعەتێکی شاعیرانە مەوجوودەو شنە باێکی خەفیف کافییە ئەو پەردەیە لا بدات، بە هەموو مەحاسینی بەدیعیەوە شەخڵیەتی شیعرییەی دەرخا. زەمان هات‌و تیپەڕی ئەرز بە دەوری خۆیدا چەند خولێکی داو نیهایەت لە سولەیمانی یەکمان گرتەوە. ئەمجارە بە مەمنوونیەتەوە دیم کە کزەبایەکە هەرچۆنێ بووبێ هەڵی کردووەو تا دەرەجەیەک بووە بە سەبەبی دەرخستنی شەخڵیەتی.
شەوێک کە دیسان لە مەوزوعی شیعرو ئەدەبیات ئەدواین بە دەنگێکی نزم‌و ڕوویەکی سوور هەڵگەڕاوەوە بەعزێ شیعری خۆی لەبەر خوێندەوە، زۆرم لا جوان بوون و تەڵەبی نوسخەیەکم لێ کرد.
سبەینێ مەنزومەکانم لێ وەرگرت‌و کە دووبارە پیا چوومەوە بەتەواوی تەحەققوقی کرد لەلام کە ئەمانە زۆر دوور بوون لە شیعری شاعیرێکی موبتەدی ، یا هەوەسکارێک. عەلاوەی ئاهەنگ‌و سەلاسەتی مەوزوعەکانیش جازبیەدارو پڕ حەیات بوون بە خەیاڵێکی وردو بڵند هۆنراونەوەو بە تەرزێکی جوان‌و ڕەوان ئەدا کرابوون.
لە گوفتاری، وا تێگەیشتم ئەیەوێ ئەمانە لە گۆشەی نیسیاندا بمێنێتەوە. فەقەت من شەخڵەن ئەم ئیهمالەم بەرامبەر بە ئالیهەی شیعر بە جورم عەد کردو بیلنەتیجە قەراردرا بە ناوی موستەعارەوە نەشر بکرێن.
بە ئیفای ئەمە خدمەتە ئەدەبییە زۆر مەسرورم ئەوەل مەنزومەی بە حورمەتەوە خرایە بەر نەزەری خوێندەوارانی گیرام.

**پیرەمێرد**

ژیان ، ٦ی ئاب ١٩٣١



# جوانی بێ ناو

قژ کاڵی، لێو ناڵی، پرشنگی نیگا کاڵ،
ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا ئەختێک ناڵ!
ئەی کچە مەنگەکەی بەدەنگی چپە دوو،
گەنلەمووی دەموچاو، مەچەک هەڵ نەگرتوو..
ئەی ئەندام وردیلەی، ئەرمۆڵەی، ئێسکسووک،
ئەی بەرگی ساکارت دلگیرتر لە هیی بووک!
ڕاستە من ڕێبوارم، سەر پێیی ئەڕوانم،
بەڵام وا جوانیی تۆ کاری کرد لە گیانم،
ئەڵێی، ئەک هەر ئێستا، عومرێکی درێژە
بەو دەستو پەنجانەت برینم سارێژە!..
ئەی کچە کاڵەکە! جوانی تر با زۆر بن،
لە باخچەی بەهارا گوڵباخی بەرخۆر بن،
با ڕەنگیان پەرداخت بێو جێگەیان سەرچڵ بێ،
بە واتەی خەڵکی تر با ناو یان شاگوڵ بێ،
گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە،
کە لەژێر سێبەری تووترکا خامۆشە!
لە هەموو ئاسمانا ئەستێرەی بەربەیان!
ئەخاتە دڵی من هەستێکی سپیو جوان!
لە تەختێک هەڵدەستێ هەزارو یەک ئەغمە:
ئەوەیان شیرینتر دێتە گوێم زۆر نزمە!
کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو:
لە بنیا بلەرزێ مرواریی زیخو چەو،
جوانترە لە لای من لە دەریای بێ سنوور
شەپۆلی باتەبەر تیژگی ڕۆژ شلّپو هووڕ!
قژ کاڵی، لێو ناڵی، پرشنگی نیگا کاڵ،
ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا ئەختێک ناڵ!
دەربەست نیم ڕێبوارم، دەربەست نیم ڕەوتەنیم،
ئەزانی شپرزەو دەربەستی ئێجگار چیم؟
هیی ئەوەی نیگارێک لە یادم کێشراوە،
شۆخێکی نایابە، بەڵام ئاخ، بێ ناوە!..



# پایز

پایز! پایز!
بووکی پرچ زەرد،
من مات، تۆ زیز :
هەردوو هاودەرد!
من فرمێسکم، تۆ بارانت،
من هەناسەم، تۆ بای ساردت،
من خەم، تۆ هەوری گریانت..
دوایی نایە: دادم، دادت،
هەرگیز، هەرگیز،
پایز! پایز!
پایز! پایز!

شانو مل ڕووت،
من مات، تۆ زیز،
هەردووکمان جووت
هەرچەند گوڵ سیس نەبێ بگرین،
ئاڵتوونی دار نەڕژێ بگرین،
پۆلی باڵدار نەفڕێ بگرین،
بگرین.. بگرین.. چاومان نەسڕین،
هەرگیز، هەرگیز،
پایز! پایز!

گۆران



ڕوڤار
ژمارە ٦٠
خەرمانانی ٢٧١٠ کوردی

# یادی (بێ کەس)

هەڵدانەوەی لاپەڕەی کۆنی عومرە
بۆ یە فرمێسک لە چاو یایە ئەم شیعرە!
کوردستانی ئەو سەردەمە وا تار بوو،
بەفری زستان گوڵی باغچەی بەهار بوو.
بلبلەکان لە قەفەسا قەتیس بوون
لەسەرمانا ئەلەرزین، وەک گوڵ سیس بوون
ئەو مەلانەی دالدەیەکی گەرمیان بوو،
دانەو یلەی چینە مایەی شەرمیان بوو.
پەرەی گوڵیان بەرەنگی (ڕوو) سوور نەکرد،
وا هەڵبەستیان پێشکەش بەرەوژوور نەکرد.
جار جار لەپاڵ مەتحی درۆی زۆردارا،
چەن گوڵێکیش نەکرا بەقژی یارا..
یاری هەڵبەست یان هیی تێری بێ دڵ بوو،
یان هیی لاتی ناپەسەندی لای گوڵ بوو..
بەڵێ هەبوو بلبلی وایش، برسی بێ،
تەماع هەرگیز شیعری پێ نەنووسێ

هەرە برسیو هەرە لێ بووردووی دەستە
(بێ کەس) زیاتر، خەباتی خستە بەستە.
لە باغێکا فرمێسکی (خانی) ئەرژا،
دڵی (حاجی) لە ئاگرا ئەبرژا،
(بێ کەس) دڵی بڕوای ئەدا خامۆش بێ،
لە بەستەیا نیشتمان فەرامۆش بێ !
لە ڕووی شێری ڕووتا وەستاو ئەڕانی،
نازادیی و یست بۆ گەلو نیشتمانی!

زمان بڕین سزای قسەی ئەستەق بوو،
توانجی (بێ کەس) بۆ دوژمن بەردی ڕەق بوو..
کزی چاو بوو.. بە چاوی هۆشمەندی
لە ناسۆ ی دوور برایەتیی کرد بەدی،
لە ناو هەردوو ئەتەوەی عەرەباو کورد،
بەبانگی بەرز ئەمەی خستە شیعری ورد.
لە کاتێکا دەستی دوژمنی نامەرد
تۆ وی کینەی چاندبوو وەک گەرای دەرد.
بەو نیازەی بکەو یتە خۆ خۆ ری:
کوردو عەرەب، تورکمانو ناسۆ ری!...
ئەمو یست (بێ کەس) ئێستا بەسەر بژیایە،
ئەم گەرمییەی برایەتیی بدیایە.
بیزانیایە براگەورەی عەرەبمان،
چەن دڵسۆزە بۆ خزمەتی ئەدەبمان..
بیزانیایە گەوهەری نرخی (بێ کەس)
براکانی چۆن ئەیگێڕن دەساو دەس!
(بێ کەس)! لەشت با لە خاکا ڕزیبێ،
با مرۆڤیت بەیاسای مەرگ ڕازی بێ،
بەڵام، بلبل کە ئامانجی لەم ژینە:
بەس خو یندنی بەستەی شیرین شیرینە،
تاکو دەنگی چریکەی بێ لەسەر دار،
هەر زیندووەو، هەر بلبلەو، هەر باڵدار!
کەوابێ تۆیش تاکو (داری نازادی)
بەستەی کوردە، ئەژیت، ئەمری یادی!...
بەغدا. کانوونی یەکەمی ١٩٦٠

# لە بەندیخانە...

تاوانم کرد.. گەل پێوەی نام مۆری ناپاکی،
بۆ زیندانە کۆچی ژینم، دنیای ڕووناکی!
وتم: گەل.. ئەوا! گەل فرۆشی دەزگاو دووکان گیر،
عاری تێر پۆش، خەوشی برسی موو بەموو ژمێر!
دزی تێرو بێ پێویستی ناردە سەر برسی،
وتیان دزەو پرسیارێکی زۆریان لێ پرسی..
کابرای برسیی بێ تاوانیش مل کەچو سەر شۆڕ،
چۆنیان لێ ویست بۆی هەڵڕشتن وەڵامێکی زۆر!
کار تەواو بوو. قۆچی دزی بوو بەسندووق بڕ،
مێشک ماندوو، دڵ بریندار، گوێ لە توانج پڕ...
لوولەی تفەنگ لە برِبڕەی پشتی قایم بوو،
تەقەی پۆستاڵ بەشوێنەوە: هەر هاتو هەر چوو..
ئەوا ئێستا باغچەی ژینو شیعرو خەیاڵی
بوو بەژووری بەندیخانەی تاریکو خاڵی!
سا خوات لەگەڵ دنیای جوانی! دنیای ڕووناکی!
تاوانم کرد، گەل پێوەی نام، مۆری ناپاکی!
ئیتر من هیچ نە نادەمیم، نە ئیشتمانی،
نە ئەندامی ئەم کۆمەڵەم، نە کوردستانی..
نا. بۆ کوردێک کفرە ئێستا کوردستان وتن،
چەرچییەکانی ئیستیعمارم لێ ئەبنە دوشمن!
لە عێراقاو بەقانوونو پێڕەوی عێراقی:
کوردێک گیراو بەندو زنجیر کرایە لاقی،
حەقی وەک کورد هەر نەبووەو، هیچ وەک عێراقییش
بزر نەکا، لە بەندیشاو لە پاشی بەندیش!...

* * *

ئێستا منو خەڵقی ئەودیو ئەم چوار دیوارە
لە بابەتی جوێ شێلراوە، هەستیمان، دیارە!
ئەوان چەشنی فریشتەنو بێ گەردو پاکن،
دنیا هەر بۆ ئەوان خوڵقا ئەوەندە چاکن!
بۆ یان هەیە بەپێی دڵخواز بخۆن، بنۆشن،
سەربەست بژین، بەختیاری پێک پێک بنۆشن،
گوێ بگرن تێر لە ئاوازەی مۆسیقای شیرین،
کۆڕی بەزمو ئاهەنگ بکەن پڕ لە پێکەنین،
بەناو جوانیی تەبیعەتا بێنو بچن مەست،
بۆ کام میوەی زۆر سەرچڵە درێژ بکەن دەست...
بەڵام منو وەک منەکانی بەندیخانە،
دروست بوونمان لە قوڕێکە ئەهریمەنانە!
بۆ تاریکی، بۆ شەرمو عار، بۆ خەم خوڵقاوین،
لە بەهەشتی ئەودیو دیوار بێ بەش کراوین!
مانگو ڕۆژو ئەستێرەی خواش لەگەڵ دەشتو دەر،
قانوون ئەڵێ: قەدەغەیە دەرحەق تاوان کەر!

* * *

ئەی مانگو ڕۆژ، ئەستێرەی شەو، هەڵ مەیەن ئیتر
بۆ ئەودیوی بەنهێنی لە تاوانکەر پڕ!
بۆ ئەودیوی بەئاشکرا فەز یلەت فرۆش،
لە پەناوە پاس کەری دز، واعیزی سەرخۆش!
بۆ ئەودیوی شێخو مەلا بەشی زۆر جاسووس،
زۆربەی ئاغا بەپێست مەردو، بەئێسک بێ نامووس
بۆ زۆرداری ناوخۆ درۆ، لەلای بێگانە
دەست لەسەر سنگ لەبەر ئەکەن جلی ژنانە!
بۆ ئەودیوی کە زۆر پیاوی گەورەو ناوداری
گیانی چەورو چڵکنە وەک لەشی هەژاری!
بۆ ئەودیوی پڕ لە درۆو پڕ لە دەسیسە،
بۆ ئەودیوی کە هیچ ئەبێ وەک ئەم دیو پیسە!
ئەی تیژگی ڕۆژ! ئەو وڵاتەی کۆمەڵی پاکە،
ئەندامێکی وەک منی تیا نازادو چاکە،
ئەندامێکی وەک منی بۆ شیعرو ئەدەب زاو،
تیا نابێتە پارەدزی برسییو ناتەواو!

دزی برسی- یان تەمەعکار!- دەوری فرمانی
ناگرن، هەتا بەقوڕ بگرن ماڵی وێرانی!
ئەو کۆمەڵەی خوا پێداوە، خاوەن بەهرەی فەن
بۆ پیا نازین بەخێو ناکا، نەک ڕیسوایی‌و پەن!...
بلبلێ بووم ئامادە بووم هەتا بمێنم
بەنانی وشک، بەرگی پەڵاس بۆ گەل بخوێنم
بەڵام گەلی بەشرینقە خەو لێ خراوم
گوێی نەدامێ هەتا کەوتم، چلکن بوو ناوم!

* * *



ئەی تریفەی مانگی سپیی دەرکی دەلاقە،
با پیس نەبی، خۆت مەدە لەم کوردی عێراقە!
وڵاتەکە داگیرکراو، ئەتەوە دیلە،
باو لای دوشمن نامەردێتی، مەردی زەلیلە!
کای لەبەر سەگ دانراوە، ئێسقان بۆ ئەسپە،
سەر لە جێی کلک بەند کراوە، کلک لەسەر چەسپە!
شێو ێنراوە بەدەستی قەست شیرازەی کاری،
تا ئاسان بێ بۆ سوورفلی چرچ ئیستیعماری،
وەک بزن مژ دەم بنێتە جواناوی ئەوتی،
لێی دەرهێنێ دوا دەنک و فلسی دەستکەوتی!
ئەی مانگی بەرز، سا هانا بێ، مل بنێ بۆ دوور،
بۆ وڵاتێک جێی نیزام بێ‌و سەربەست‌و ڕووسوور،
بۆ وڵاتێک هاونیشتمان تیایا ئازاد بێ،
ژێری دڵسۆز باوک بێت‌و گەلیش ئەولاد بێ!
هەر ئەندامە بەپێی بەهرەو لێهاتنی خۆی،
ماوەو جێگای فرمان کردن ڕێک خرا بێ بۆی.

نیش بکات‌و، نان بخوات‌و، بەرگی خۆی بدرێ،
بەبێ ئەوەی ناچار ببێ ڕێی تاوان بگرێ!
نا لەو خاکە پرشنگ ڕێژیی پرچی زێرینت،
ئەی مانگی جوان سەنگین ئەکا نرخی بینینت!...

* * *

ئەی ئەستێرە! ئەستێرەکان.. بەرزو گەش‌و دوور...
ئەگەرچی من ناتانبینم لەبەر سەقفی ژوور،
بەڵام دیارە، ئێستا جوان جوان چاو ئەترووکێنن،
ڕووی ئاسمانی شینی ژوور سەر پێ ئەکەنێنن!
ناخ، نازانن خاوەن چێژان، فرمێسکی چاو یان
ڕێگا نادا بڕواننە زینەتی ئاسمان،
لەم وڵاتەی کە ڕووی خاکی گوڵ گوڵیی داغە،
برینی جەرگ لە باغچەیا لە جێی گوڵباغە!
خواتان لەگەڵ، ئێوەش بڕۆن، لێرە ئاوا بن،
یا ئەکەون وەک من کەوتم، ئەستێرەی چا بن!...

* * *

ئەی دنیای جوان، دنیای بەهار، دنیای ڕووناکی،
تاوانم کرد، گەل پێیوە ئام مۆری ناپاکی،
فڕێی دامە پشتی دەرگای ئاسن‌و پۆڵا،
لە ژووری تەنگەڵانی تاریک‌و چۆڵا...
لەگەڵ ئەوەی گیانم تیایە بەهەناسەو ئەبز،
ئەڵێی مردووم خزاومەتە ژێر ئەڵحەدی قەبز،
بەقەد کونی دەلاقەکەم ئاسمان دیارە،
ئەمە هەموو ناونیشانی ڕۆژی بەهارە:
بۆ بەندییەک کە زیندانی دڵی خەمباری
دوا دەلاقەی گیراوە لە ڕۆژی بەهاری،
بۆ بەندییەک کە پەیوەندیی لەگەڵ دنیای دەر
بەدەستی (داد) پچڕێنراوە، هاوڕێ‌و برادەر
لە کردەوەی ناشیرینی لێو یان گەزیوە،
لە هاوڕێیی‌و برادەریی دەستیان سڕیوە..
بۆ بەندییەک، کە هیچ نەبێ بەرەڵڵا بێ،
بەپێی قانوون کۆشێ منال منالی نابێ
کوڕی خەرجیی لێ وەرناگرێ، کۆشی نابینێ،
کچی ساوا- کێ چوزانێ- هەتا بمێنێ!...

# زەنگی پەستی

ئەوا دیسان لە گۆشەی نادیاری
دڵم، هەڵسا زرەی زەنگی فگاری،
بەئەسپایی، بەبێ هێزی، بەناستەم،
هەوای ڕۆحم ئەخاتە سەر لەرەی خەم!
بەئەسپایی، بەلەرزۆکی، هەژاری،
ئەناڵێنێ لە شوێنی نادیاری!...
زەمانێک دێتە گۆ هەرچەن زرەی دێ،
کە تێر نابم لە گوێ گرتن بەدوو گوێ!
زەمانێک، بەستەیەک، دەنگێک، ئەوایەک،
سکاڵایەک، هەناسەو ناخۆ نایەک...

کە تێی ناگەم، کە نازانم ئەڵێ چی،
بەڵام خوڕ خوڕ لەگەڵیا ڕۆحم ئەگری!
چییە ئەی ڕۆحی بێ لێوارو بێ پەی،
لە تۆ ناشارەزایی من هەتا کەی!
چییە ئەم دەنگە؟ ئەم ئاوازە دوورە؟
کە پێ هەڵهێنەری چاوی شوعوورە؟
کە دێ پەستم، کە نایە ئارەزووی دڵ
بەدوو یا وێڵ ئەبێ: مەنزڵ بە مەنزڵ!
چییە ئەم زەنگە زرنگەی دێ بەماتی
کە ژێر تەم کەوتووە شوێنی وڵاتی؟...

# بانگێک

## بۆ پۆڵ ڕۆبسن

ئەی بلبلی ئاشتیخوازی، پۆ ڵ ڕۆ بسن!
ئەو شێتانەی لە خوێندنت ئەترسن
دەمیان گرتی، نیاز یان هەبوو ئاوازە
قەدەغە کەن لە گو ێچکەی دنیای تازە..
بەر نەگیرا بۆ یان لە ڕۆژ... ناچار بوون
ڕێی فرینت لێ ببەستن بۆ دەرچوون!
ئەو شێتانەی سازو کەمان ئەشکێنن،
بلبل ئەگرن پەڕی باڵی دەردێنن،
نایەڵن بێی، بۆ گەلانی ڕۆژەڵات
بەستە بڵێی، تیژ کەی ئاگری خەبات!
ڕۆژەڵاتمان: لای ڕووناکی ئاشناتە،
لای شەو یشی بێدارە، دڵی لاتە..
چاوەنوارین قەفەسی کۆ ن بشکێنی.
پەساپۆ رتی دەنگ لە سنوور بنو ێنی.
(جولیۆ ئەیوت: ڕاستیو گۆ ڕانیی ڕۆ بسن
بێ پەساپۆ رت سنوور ببرن، ئەترسن؟)
بمانگەیتیو بەئاوازەی وەک هەنگو ین
لە ناومانا بخو ێنی بۆ: ئاشتی ژ ین!
وا بخو ێنی کە سپی و زەرد لەگەڵ ڕەش
گو ێت بۆ شل کەن وەک یەک دڵو وەک یەک لەش!
سپیو زەردو ڕەشی ڕ ێگای یەک گرتن
تینووی گیانی گۆ ڕانیتن، پۆ ڵ ڕۆ بسن!..
پۆ ڵ ڕۆ بسن! ئەی پۆ ڵ ڕۆ بسن! ئەی پۆ ڵ ڕۆ بسن!
پاڵەوانی ئاشتی! بلبلی وتن!

تا ناو دۆڵی دوورو کلای کو ردستان،
ناوو دەنگت ئاشنان بەگو ێچکەی نیسان.
کوڕی ساوای حەوت ساڵانم ئەتناسێ،
ناوت ئەبا، وەک هیی مامی دراوسێ!..

سلێمانی-١٩٥٤

# بەردەنووسێک

(لەسەر کێلی گلکۆی گەورە کچێک هەڵکەندراوە)

لە خاکی گلکۆما نەی گۆڕستان گەڕ
ناخێک بنێژە،
بە کێلی مەرمەڕما فرمێسکێکی تەڕ
لەچاو بڕێژە!
لە دنیای ڕووناکتا منیش گیانێ بووم
لە لەشی جوانا.
و ێنەی پەپوولەیەک نەهاتم نەچووم
بەناو گوڵانا!
کۆشی گەرمی دایک جێگای نازم بوو،
گیان بووم لای باوک،
ناوبانگی چاوڕەشی ڕوشتەی ڕازم بوو،
بووبوو بەلاوک،
بەڵام ناخ کە ناڵەی لاوکی لاوان
زوو مەستی کردم،
بە ڕێی عەشقی پاکا نام ملو. تاوان
بۆ لاڕێی بردم!
لاوێکی نامەردم تووش هات لە ڕێما،
بەسو ێنو پەیمان،
وەک ڕەشمار پەپکەی خوارد، نووست لە ناو جێما،
نابڕوومی تکان!..
پاش ئەوەی ماری پیس زەهری خۆی ڕژان،
کشایەوە کو ن.
هۆی شەرمی لە باوکم کرد بەمایەی ژان
کەتن کەری ون...

ڕووی نیازی زەردی دایکو باوکو خۆم
بێ سوود کەوتە گەڕ،
خۆ یشی چەشنی باوکی تفی هەڵدا بۆم،
گو ێی لێ کردین کەڕ!
ئەو کوڕ بوو، سەرەڕای ئەوەش دەستدار بوو،
بەدەستووری گەل
ناپاکیی کردەوەی دوور لە پرسیار بوو،
بەڵام، ناخ ئەجەل!
منی (کچ) مامزی بەندیخانەی ژین:

سزای تاوانم،
بەدەستی باوکی خۆم چووم بەسەربڕین!...
پرچی پەخشانم،
تلا لە خو ێنەوەو کەوتە سەر چلوم،
نیتر نەمبینی:
لە جەرگی باوکما سەری براوم
چۆ ن بوو برینی!
یان دایکی دلسۆ زم و ێرای بەبێ شەرم
بۆ جوانەمەرگی
وەک دایکان شیوەنێک بگێڕێ بە گەرم،
ڕەش کا بۆ ی بەرگی!...

# بۆ هیوای کوڕم

هیوا، مەگری، هەنسکی نیوەشەو بەس هەڵدە، بەس بگری!
لە چاوی بێ قەرارم بۆچی دەرمانی وەنەوز ئەبڕی؟..
کوڕی خۆم! کۆرپەلەم! میوانی دنیای تازە خوڵقاوم!
ئەداگریەت بەزەربەی چز لە ڕۆحی پڕ گلاراوم!
چییە ئەم گریە بێ غایە، کڕووزەی نیوەشەو خورپێن؟
چییە ئەم قەترە وردانەی لە چاوت بێ مەنال ئەڕژێن؟
لەگەڵ ئەو غونچە ساوایەی لەسەر خەڵفی بەهار ئەڕوێ
چییە فەرقت؟ لەبەرچی ئەو هەتاکو سیس ئەبێ ئەنوێ؟
وەکو ئەو بەرخە بچکۆلەی کە هەر ئێستا لە دایک بوو.
لەبەرچی ئەشنەیی یاری هەڵت ناداتە سەر پاشوو؟
ئەڵێی ئەو زەرنەقووتەی پەپکە مارە فەرشی هێلانەی:
چ نیشێکە، کوڕم، بۆچی لەسەر ئەم هەڵکڕووزانەی؟
چییە، توخوا چ سیرڕێکە وەها مەحکوومی گریانی،
کە تۆ هێشتا لە خەم ناگەی؟ لە مەعنای گریە نازانی؟
ئەگەر وەک باوکە حەسرەت دیدەکەت زەهرت بچێژایە،
زەمان گەردی ئەمەلتی گشت بەدەم باوە بپێژایە،
لەناو کڵپەو بڵێسەی نائومێدیو حەسرەتا یەکسەر،
بسووتایە بەهاری عومری جوانیت: هەم گوڵو هەم بەر!
بەڵێ، ڕۆڵەم، ئەگەر وەک من کەمێک بەدبەختیی نیدراکیش،

لە تۆیشی ڕەش بکردایە، ئەوەک شەو، ڕۆژی ڕووناکیش،
حەقت بوو عەرش بلەرزێنی بەناڵەی ڕۆحی پڕ نێشت،
لە ئەستێرەی سەما بیژێنی فرمێسکی دڵی ڕێشت!
حەقت بوو ئەم هەموو گریانی نامەفهووم‌و بێ مەعنا:
زمانی بەست‌و تەقریری شکاتت بێ لە دەست دنیا!

حەقت بوو بێوچان بگری بەسەر تاوانی باوکیما،
بەحر پڕکەی لە تف بیدەی بە ناوچاوانی باوکیما!...
بەڵام، ڕۆڵەم، کە تۆ ئێستا لە فەجری زیندەگانیتای،
لەبەر دەرگای تەلیسمی بەختی مەجهوول‌و نیهانیتای،
بەچی مەعلووم بەشوێنی هیی منا ئەرژێ جەمی عومرت؟
سەراسەر پێکەنین‌و خوڕڕەمی نابێ خەمی عومرت؟...
بەڵێ، بەرخم! ئەگەرچی هەروەکو یەک ژینی گشت لایە
لە بەینی بێشکەوو قەبرا، بڕینی عەینی ڕێگایە!
هەموو هەر قافڵەی بێ ئیختیاری سەرزەمینێکین
هەموو دێین‌و دەڕۆین.. تاکوو ئەگەین، یەعنی ئیتر ئەمرین،
وەلێ کۆچی ژیان کۆچێکی پڕ سیحرو پڕ ئەفسوونە:
لەیەک سەرچاوە دوو قەترە: یەکێ لێڵە، یەکێ ڕوونە!
ئەوەندەی ڕۆحی مەنیووس‌و مەلووڵ تاریک ئەکا دنیا،
ئەوەندەیش نوور لە ڕۆحی شادەوە ئەرژێ بەسەر سەریا!
کوڕم! هەروەک لە نوعجووبەی ژیانا بەختی بەد ئەگری،
شتێکیش- بەختیاری- پێکەنین گرتوویە چوار دەوری!
بەخۆڕایی مەترسە، خەم مەخۆ، مەگری لە ئێستاوە!
بەچی مەعلووم کەچی لەو تەختی ناوچاوانە نووسراوە؟...

دەمی ڕاپەڕینە، دەمی ڕاپەڕین!
هەتا کەی بە سستیو بە پەستی بژین؟
پەلامار دە، ئەی کورد، عەرەق ڕشتنێ!
لەدڵ کرمی ناکۆکی دەرکردنێ!
بەیەک بوونە گشت:
پتەوبوونی پشت!
بە یەکبوون ئەبێ:
گەلت پێش کەوێ!
دەمی ڕاپەڕینە، دەمی ڕاپەڕین!
هەتا کەی بە سستیو بە پەستی بژین؟
بەلادا بکە چاکی مەردایەتی..
درێغی مەکە گیان لە کوردایەتی..
بگرمێنە وەک شێر، بچۆ ناوی بەرد
بڵێ: کوا هەقی ژینی ئینسانی مەرد؟
درشت تاکو ورد،
ئەکەین دەستو برد،
بەهەق چۆن ئەگەین؟
پشوو چۆن ئەدەین؟

دەمی ڕاپەڕینە، دەمی ڕاپەڕین!
هەتا کەی بە سستیو بە پەستی بژین؟



# جگەرتانین

## (بە زمانی منالّی ساواوە)

جگەرتانین، ساواتانین،
گوڵی باخچەی هیواتانین،
بزەی ناو بێشکەین بۆ دایکان،
ڕووناکیی چاوین بۆ باوکان،
هێزی دوارۆژی ئینسانین
بەکەڵک نەبین هەروەک جوانین
ماوە مەدەن شەیتانی شەڕ،
دەزگای کینەی بخاتە گەڕ،
بەچەخماخەی تیشکی ئەتۆم
ئیسقانماتان بۆ بکا بەمۆم!
ماوە مەدەن بێشکەی منالّ
گڕ تێی بەربێ وەک کۆی زوخالّ
ماوە مەدەن ڕووی ئەرز هەموو
بێتە هێلانەی بێ بێچوو!..

ڕۆڤار
ژمارە
٦٠
خەرمانانی
٢٧١٠
کوردی

# پەخشانەکانی گۆران

## ئومێد ئاشنا

پەخشانەکانی گۆران ڕەنگدانەوەی سەردەمی گۆران خۆیەتی، ئەم پەخشانە هونەرییانە ئەوەندەی شیعرەکانی لە برەودا نەبوونو دەنگیان نەداوەتەوەو وەک ئەوان سەرنجی خوێنەرو ڕەخنەگریان بە لای خۆیاندا ڕانەکێشاوە.

گۆران خۆشی بەردەوام نەبووە لە سەریانو لە ڕاستیدا ئەو گرنگییەی بە شیعرەکانی داوەو هەوڵی تازەکردنەوەی تێدا داوە بەو شێوەیە لە پەخشانەکاندا کاری نەکردووە. ئەم پەخشانانەی لای ئێمە زیاتر لە ڕووی ئیستاتیکیو ڕۆمانتیکییەوە تەماشایان کراوەو گرنگییان دراوەتێ. لە نێو ڕستەکانی بوونو نەبوون ئاسکیی خەیاڵی ڕۆمانتیکیو ترپەی دڵی مرۆڤ تێکەڵ بە بێهیوایی و گۆشەگیری دەبێت.

هەندێ جاریش وەک دیاردەیەکی مەعریفی چەند مانایەکی گەش بۆ ژیان دەدۆزێتەوە. پەخشانەکان زیاتر بە لای مەسەلەکانی ئافرەتو کاریگەری جوانیەکاندا دەچێت، سۆزو هەڵچوونو فرمێسکە. ئەم هەستو هۆشە هێڵێکی تەریبی دروست دەکەن لە ماوەیەکی تایبەتیی ژیانی ئەودا ئاسەواری داهێنانەکانی خۆیان بەجێ دەهێڵن.

بڕوانە ناونیشانی پەخشانەکان "چاو، فرمێسک، لاوانەوە، تاسەی لێوی ئاڵ، ئەنجامی هەڵبەست، تاسەی هاودەرد". هەر ئەمەشە کە زۆر لایەنی لێکچوون هەیە لە ماناو تەعبیرکردندا لە نێوان ئەم پەخشانانەو شیعرەکانی گۆراندا. لە پەخشانەکاندا باسی گەورەیی شیعرو دنیا فراوانەکەی کردوە، لە پەخشانەکانی "ئەنجامی هەڵبەست، نامەی گۆران بۆ پیرەمێرد" تەواو چۆتە ناخی ئەو ساتانەی شیعری جوانی تێدا لەدایک دەبێت:

"کاتێک منو تۆ ئەمرین هەی داخ، عیشوەو جوانی تۆ، شاعیرییەتو عەشقی من لە ڕووی زەویدا شوێنیان نامێنێ، ئەو کاتە ئەم بولبولە دەنووک ئەکاتەوە، بەناو نەوەی پاشەڕۆژدا، بەناو خوارو و ژووررووی کوردستاندا سەرگوزشتەی عەشقی من و تۆ دەماودەم ئەگێڕێ وەک بەسەرهاتی لەیلاو مەجنون".

یاخود زیاتر شیعر لە خۆشەویستیدا دەتوێنێتەوە، شیعر لە گیانی خۆی بەنرختر دەزانێ، خەرامان دەبێت بە نیشانەی تکاو هاناو پەنای هانابردنی دەباتە بەرو خۆکوشتن لەوە بە باشتر دەزانێت کە شیعرێکی خۆی بە دەستی خۆی بسووتێنێ.

"ئێستا خەرامان بە دڵێکی ڕەقەوە، بە ڕقێکی پڕ لە قینەوە ئەنوسێ تکات لێ ئەکەم ئیتر نامەوێ بژیت، بە گەیشتنی کاغەز دەمانچەیەک بنێ بەسەر دڵی خۆتەوە".

من دڵنیام خەرامان دەستکردی خەیاڵێکی ڕۆمانتیکی نییە، بوونێکی مەزن بووە کە هەستو ویژدانی گۆرانی هەژاندوە، گۆران ڕۆیشتو ڕەنگە خەرامانیش ئاسەوارێکی لە دنیادا نەمابێت، بەڵام نە شەپۆلەکان زیاتر هەڵدەچنو نە دەنگەکان کپتر دەبنو نە دەریاکە ساتێک ئارام دەبێتەوە!

هەموو ڕابردووەکان لە زاکیرەی گۆراندا دێنەوە ژیان، زۆرجار هەموو ساتەکانی ئێستای دەبێت بەو ڕابردووە، کە دەبێتە خودی تەواوی ئەو:
"لە بیرمە نیوە شەوێکی ئەستێراوی هاوینی ١٩٢٩ لە بەردەم پێنجوێنی خەوالوودا زەبری زەمانە دەستی برایەتی دوو بێ تاوانی لە ملی یەکتری پچڕی، تارمایی بە هەنسکەوە لە ناو ڕەشایی گوڵەکانا بەرە بەرە ون بوو، منیش بەسەر بارگەیەکەوە شوێن کاروانی هەڵەبجەو ناڵەناڵی زەنگی تاریکی شەو کەوتم".
گۆران توانیویەتی لە ڕووی تەکنیک‌و شێوەی دارشتنەوە پەخشانەکانی هەروەک شیعرەکانی لە بەرهەمی کەسانی جگە لە خۆی جوێ بکاتەوەو فۆرم‌و ناوەڕۆکێکی تایبەتییان بداتێ، بە تایبەتی گۆران ئاگاداری ئەو بزوتنەوەو ڕێبازە نوێیانە بووە کە لەو سەردەمەدا باڵیان کێشابوو بەسەر ناوەندە ئەدەبیە زیندووەکاندا وەک نوێبوونەوەی ئەدەبی تورکی‌و ئەدەبی ڕۆمانتیکی ئینگلیزی، بۆ ڕاستی ئەمەش گۆران کەلێ دەقی ڕۆمانتیکی جوانی، ڕۆبەرت هێرک‌و شیللی‌و کیتس‌و بایرونی کردووە بە کوردی‌و بڵاوی کردوونەوە. ئێستا لە پەخشانەکاندا فرمێسک لە بەرچی‌و بۆچی:
"فرمێسک گەوهەرێکی خۆشەویستییە کە خوا لەناو هەموو مەخلوقاتا تەنیا پێشکەشی ئینسانی کردووە، تەنها ئەوە نییە ئەتکێتە برینێکی نەزیفی دڵەوە"!
سەرچاوەی ئەم فرمێسکانە چاوە لای گۆران دەبێتە دوو پەڕە لە کتێبێکی موقەدەس پڕە لە ئایەتی حوسن، حەقیقەتە ڕۆح سڕەکانی دڵ، ڕازەکانی دەروونی بە حەرفی نوور تیا نووسراوە.
"لە چاو سیحراویتر چ ئەسەرێکی ڕۆحین چ کتێبێکی ئاسمانی هەیە؟!".
ڕەنگی چاوەکان لای گۆران دەبنە حەقیقەتێکی ڕووت‌و پیرۆز، چاوەکان لە چاوی ڕەش‌و هەنگوینی‌و پیرۆزەییدا، جوانییەکان کۆدەبنەوە بە هەموویان ئازارێکی پڕ نووری هەقیقەت دەخوڵقێنن کە تەواو ئەمە خودی گۆران یا ڕاستتر مەزنیی داهێنانە لای گۆران، ئەم هێڵە دیارو ئاشکرایە هەرچەندەو لە دوای ئەم ماوە مێژووییە هزرو بۆچوونەکانی گۆران لەم بارەیەوە کزو لاواز بوون بگرە هەر نەمان، بەڵام چونکە ئەم مەسەلەیە بە خودی گۆران‌و ڕۆحی ئەو ئاوێتە ببوو دەبینین لە ساڵەکانی دوایی تەمەنی خۆیدا زیندوو دەبێتەوەو دەبێتە هەوێنی کەلێ لە داهێنانەکانی ئەو.
دیارە ئەمە لە بواری شیعردا وەک شیعرەکانی، مۆسکۆی جوان‌و بێدارییەک. لە هەندێ لە پەخشانەکاندا بێ هوودەیی‌و جۆرە لەدەستچوون و تێکشکانێکی دەروونی‌و ڕۆحی دەبینرێت کە سەرجەم ئەمانە لە ئاکامدا دەبنە زنجیرەیەک ئەفراندن‌و جۆرە کەشێکی وەهای خوڵقاندووە کە لە مێژووی پەخشانی هونەریی کوردیدا بە ئەمری‌و ڕۆحی داهێنانێکی ئەدەبی بەرزەوە ئاماژەی بۆ دەکرێت.
مەسەلە ئەدەبییەکە لای ئەو لە پەخشانەکاندا زیاتر لایەنی چۆنییەتی گرتۆتەوە، واتە نەوعیەتی کارەکە لە خودی خۆیدا دروست بوون (تەشکیلیکی) ڕۆحی بەرزو مەزنە، جگە لەوەی هەموو کایە مەعریفیەکانی سەرجەم کارەکە هەر بۆ لای زات‌و تێکشکانە دەروونییەکان دەگەڕێنەوە، بەمەش گۆران وەکی شیعرەکانی لە پەخشانەکانیدا وەک خوڵقێنەرێکی تایبەت بەخۆی بوو.
پاڵەوانەکانی پەخشانەکان، "ئەنجامی هەڵبەست، تاسەی لێوی ئاڵ، چاو، تاسەی هاودەرد" هەموویان لە ئاسوودەیی‌و دڵنیاییدا بەرامبەر بە دڵەڕاوکێ‌و نیگەرانی گۆران وەستاون‌و واتە، لای ئەوان هەموو ئارامی‌و ئاسوودەییەک‌و لای ئەمیش هەموو نیگەرانی‌و دڵەڕاوکێ‌و هەستکردن بە تێکشکان.

ئەگەر تەماشای ئەم کێشەیە بکەین لە ئەدەبیاتی جیهانیشدا نموونەیان زۆرەو بە ئاشکرا دیارە، وەک: نامەکانی کافکا بۆ میلینا-ی خۆشەویستی، یان نامەکانی جبران خەلیل جبران بۆ ماریا هاسکل، تەنانەت نامەکانی شاعیرێکی مولتەزیمی وەک نازم حیکمەت کە چۆن لەوپەڕی جیهانی ڕۆمانتیکیەتەوە بۆ بیریا خانم-ی خۆشەویستی دەنووسێت.
هەروەک ساتەکانی ژیان لەناو وشەی پەخشانەکانی گۆراندا ئەگەر بچینە جیهانی کافکا-وە هەمان ئەو ساتانە بەسەر دەبەین کە لەگەڵ گۆران-دا بەسەرمان بردووە. کافکا- بەم جۆرە بۆ میلینا دەنووسێت:
"هەست ئەکەم وەکو کەسێ وام کە پێش ئەوەی پێی بچرێ بە هیچ گوناهێکا دەرگای بەهەشتی بۆ بخرێتە سەر پشتو هەندێ لە شنەبای بەهەشت هەڵمژێو لە وەسوەسەی شەیتانو دۆزەخ ڕزگاری بێ. نامە یەک لە دوای یەکەکانی تۆ لە باتی ئەوەی گیانم بەتین بکاو هێزم بخاتە بەر زیاتر پەژموردەو پەرێشانم ئەکا، من لێوی خۆم لە کاتی خوێندنەوەدا ئەکرۆژم، هیچ شتێ جێی دڵنیایی نییە، من ڕۆژو شەوی دوێنێ وەکو منداڵێ لەگەڵ دایکیا بێو ئەویش بە خۆشەویستیو سۆزەوە لەگەڵیا بجوڵێتەوەو گوێ بۆ قسەکانی شل بکا ئەوها گوێت لێ گرتبووم".
پەخشانی ئەنجامی هەڵبەست بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:
"توانجەکانت لەسەر سەرم بۆ سەرگەردانێکی دڵداری وەک من"
لای گۆران نامەکەی خەرامان دڵنیاییو ئاسوودەییو بێگومانی دروست ناکات. خەرامان داوای مەحاڵ دەکات لە گۆران، دەیەوێ حاڵەتێکی بۆ دروست کات کە مەحاڵەو مەرگی گۆران خۆی تیایدا بەرجەستە دەبێت، ئەو حاڵەتەش ئەوەیە گۆران بەدەستی خۆی شیعری خۆی بسووتێنێ، بەڵام میلینا ئارامیو خۆشبەختی لە نامەکانیدا بە کافکا دەبەخشێت. دواجار ئەو مەنەلۆژە پڕ کارەساتەی کە لە خودی گۆران-دا دەیخولقێنێت خۆی نادا بەدەستەوەو بەرەنگاری ئازارەکان دەبێتەوە، پەیامی خۆی کە ئەو شیعرەیە خەرامان داوای سوتاندنی دەکات. ئەم پەیامە خۆی بەمجۆرە بەرجەستە دەکات
"کاتێک منو تۆ ئەمرین هەی داخ، عیشوەو جوانی تۆ، شاعیرییەتو عەشقی من، لە ڕووی زەویدا شوێنیان نامێنێ. ئەو کاتە ئەم بولبولە دەنووک ئەکاتەوەو بەناو نەوەی پاشەڕۆژدا، بەناو خوارو ژووری کوردستاندا، سەرگوزەشتەی عەشقی منو تۆ دەماودەم ئەگێڕێ، وەک بەسەرهاتی شیرینو فەرهادو وەک بەسەرهاتی لەیلاو مەجنوون".
هەستی ئیستاتیکی لای گۆران لە پەخشانەکاندا بە جوانترینو مەزنترین شێوە دەبنە داهێنانێکی باڵا. وەک باڵای ئازارو مەینەتیەکانی ئەو، باڵا وەک باڵای پێشڕەوی ڕچەشکاندنو ئەفراندنی بەردەوام.
لە پەخشانی "تاسەی لێوی ئاڵ"دا هاوکێشەی گوڵو ژیانی ئەزەلی بەرامبەر بە "عەرشی پەروەردگار" دەوەستێتەوەو یەکتر تەواو دەکەن، واتا حاڵەتەکان لە هەموو قەلەقو تێکشکانو بێ هودەییەوە تەنیا بەسەر لێوی ئەوەوە تەواو دەبنو دەگۆڕێنو هەقیقەتی خۆیان دەدۆزنەوە.
"ئەی یار لێوت بێنە. چونکی لێوی ئاڵ، هەم گوڵی بەهاری شیعرە، هەم پیاڵەی شەرابی عیشق، ئەو گوڵەی کە ژیانی جاویدانیی ئینجانەیەتی، ئەو شەرابەی کە عەرشی خواوەند مەیخانەیەتی".
لە ئەنجامی هەموو ئەمانەدا گۆران بۆ دەربازبوونێکی ڕۆحیی دەگەڕێت، بەڵام نایدۆزێتەوەو بێ ئەنجام دەبێت، چونکە حەسرەتو مەبەستەکانی ئەو نایەتە دی. تەحقیق نابن، بەڵکو شوێنو کاتی خۆیان ون دەکەن. نە چاوی ڕەش تۆزێ دڵنیاییو تەڕیی بە باخی پەژموردەی دەروونی بەخشی، نە لێوی ئاڵ حەسرەتی ئەبەدی ئەوی گەیاندە ئەنجام، بەڵام لە پای هەموو ئەمانە وشە جوانەکان خولقاونو دروست بوون، ئەو وشانەی لە فەرهەنگی ئەبەدییەتی داهێناندا بە نەمریی بەرجەستە دەبن.



# چاو

ئەگەر جوانی ئەمامێکی سەوزی پاراو بێ چاو جووتێ گوڵی گەشە بە تەوقە سەرەکەیەوە. چاو، جووتێک شانەستێرەیە بە بەرزایی ئاسمانەوە، چریسکە چریسک ئەدرەوشێتەوە، جووتێک گەوهەری پرشنگدارە تاجی عەشق‌و جوانی ئەڕازێنێتەوە، جووتێک پەنجەرەی ڕووناکە ئەنوارێ بەسەر باخچەی ڕۆحا.

چاو: دوو پەڕەیە لە کتێبێکی موقەدەس، پڕە لە ئایەتی حوسنی حەقیقەتەکانی ڕۆح، سرەکانی دڵ، ڕازەکانی دەروونی بە حەرفی نوور تیا نووسراوە، ئاخۆ لە چاو بەلیغتر، لە چاو پڕ مەعناتر لە چاو سیحراویتر، چ ئەسەرێکی ڕۆحی چ کتێبێکی ئاسمانی هەیە.

یەکێک لە موعجیزەکانی چاو ئەوەیە وەک بەردی بەقیمەت بە هەموو ڕەنگێکەوە مەقبوولە. هەندێ چاو وەک شەو ڕەشن، هەندێکیش چەشنی پیرۆزە شینن، هەندێ چاوی تریش هەن ئەڵێی چاوی هەڵۆن، چەشنی یاقووت ئاگریان لێ ئەبێتەوە.

لای من وایە چاوی ڕەش بە جیلوەی حوزن‌و دڵۆپی فرمێسکەوە شای هەموو چاوە جوانەکانە، ئەوە نیگای شیرین، ئەوە نیگای بێ وێنە، بەڵام چاوی شین حاڵەتی نەشئەو زەردەخەنەی زیاتر لێ دێت لە ڕۆژێکی مارتا، سایەقە بۆ ئاسمانی ساف چی بێت! نەشئەو زەردەخەنەشی بۆ چاوی شین ئەوەیە! چاوی هەنگوینیش لەو کاتەدا کە لەگەڵ خەشم‌و نازا ئیمتیزاج ئەکات، ماچکردنی لە نۆشینی ئاوی حەیات گەلێ خۆشترە.

ئەی چاوە جوانەکان!

شوعلەیەک لە ئێوەدا هەیە، پێی ئەڵێن: پرشنگی عەشق‌و سۆز هەر چ دڵێک لەو پرشنگەی تێ نەڕژابێت، هەرچی شوعلەی ئەرزو ئاسمان هەیە بە جارێک هەڵگیرسێت ئینجا قوژبنێکی بچوکی ڕووناک ناکاتەوە.

گۆڤاری (هاوار)

ئەوا هەشت گەڵاڕێزان تەواو، فرمێسکی پایزی بەسەرا باری، هەشت کۆچی بەرەو گەرمیانی تەواو، پۆلی قەلو قاز دارو دەوەنیان ڕەشپۆش کرد.
ئەو ساڵانەی کۆن بە چەشنی وڵاتێک لێک جوێ بێتەوە، یەک لە دووی یەک، بەرەبەرە لە چاو ون بوون. ئێستا لە دوور دوورەوە پەڵەیەک دووکەڵی سپی لە عاستی شوێنەکەیان بەرز ئەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشا من هێشتا بە ڕووناکی، بە گەرمیو تازەیی هەشت ساڵ لەمەوپێش، هەوەڵ دیدارتم لە بیرە: لاوێکی ئێسکسووک، خوێنگەرم، دڵتەڕ، تەڕپۆش. بە جووتێ چاوی ڕەشی نێرگسی کە هەر یەکە لە عاسمانێک موقناتیسیو زەردەخەنەیان تیا بوو دەستی گوشیم. برادەرەکان بەیەک دەم گوتیان:
ئەوڕەحمان، لە پاشا مێنیشیان بە تۆ ناسی، ناوەکەت ئەوەندە بەدەم برادەرەکانتا هاتبوو، لە لێوی خۆشەویستی ئەوەندە ماچ کرابوو، گرنجیو پڕووشەکانی سوابوو، سفت بوو بۆیە هەر لە خۆیەوە لە دەم ئەخزا چەشنی مێخەکبەندی سەر کەمەرە لەگەڵ هەموو لێوێک ئەلەرزایەوە.
دەمی منیش چ زوو هۆگری ئەم ئاڵتوون ڕشتنە بوو؟ چ زوو بە زنجیرەی ئارەزووت ڕاهاتم؟ فێری براپەرستن بووم؟ لەو جارەوە هەموو سێ هەفتەیەک لەکەڵیا بەسەرم برد.
ئەوڕەحمانی هەوەڵ دیدار -بە تەراسی تازەیەوە- بە گوڵە ئاڵەکەی بەر سنگیەوە. بە زەردەخەنە ئەوڕەحمانییەکەی سەر لێویەوە، ئاشکراترینو ڕووناکترین نەخشەکانی یادمە.
ساڵی ١٩٢٨ چەند خۆشحاڵ بووم. کە هەردووکمان پێکەوە بووین بە ژێر بەفرە زۆرەکەی پێنجوێنەوە، ئەو زستانە درێژەمان بە دیار ئاگرێکی خۆشەوەو بە پێکەنینو بە گۆرانی بردە سەر. تۆ بە تەواوی بۆ نەوجوانی ژیان خوڵقابووی، بەیانی هەتا ئێوارە وەکو هەنگی برسی بە گۆرانی وتن بە شوێن کوڵی ڕەنگاوڕەنگو شیلەی شیریندا ئەسووڕایتەوە. ڕۆشنایی ژیانت ئەوەندە تیژ بوو سەرچاوەی شادی هەنگوینی هەرزەکاری لە تاریکترینی پێچو پەنادا بوایە بە شارەزایی ڕێت ئەبردە سەری. منیش هەمیشە بە شوێنەتەوە بووم.
کەڵکەڵەو ڕەوشتی دنیای دڵداریو جوانیت گەرمایی جمو‌جۆڵی تافی نەوجەوانیت، ئەوەندە لە پێش چاوم شیرین ببوو، شەوو ڕۆژ خەریکی مەشقی ئەوڕەحمانی بووم لام وابوو تۆ سەرمەشقی ژیانو نەوجەوانیت. ڕاستەقینەش هەر وابوو.
هەروا لە بیرمە نیوەشەوێکی ئەستێراوی هاوینی ١٩٢٩ بوو لە بەردەمی پێنجوێنی خەواڵوودا، زەبری زەمانە، دەستی برایەتی دوو بێ تاوانی لە ملی یەکتری پچڕی، تارمایی تۆ بە دەم هەنسکەوە لەناو ڕۆشنایی گوڵەکانا بەرەبەرە ون بوو، منیش بەسەر بارگەیەکەوە بەرەو -تەوێڵە- شوێن کاروانی هەڵەبجەو ناڵەناڵی زەنگی تاریکی کەوتم، ئیتر لەو حەلەوە ناو بە ناوێک چەند ڕۆژێک یان هەفتەیەک یاخود لای ئەوپەڕی یەک دوو مانگێ نەبێ، تۆ بە هەموو گوڕی لاوێتیو جوانی قوڵپی برایەتییەوە لە من ون بووی.
کاقەزم زۆر کەم بۆ ناردووی، بەڵام تاسەی بەگەرمو یادی بەسۆزم هەمیشە بە ڕێتەوە بووە، لەگەڵ ئەوەشا حەقم بوو زۆر دەربەستت نەبم، چونکی ئەمزانی لەناو هەچ کۆمەڵێکی ئاهەنگا بێ گۆرانی ئەڵێیت، لە هەچ پێچو پەنایەکی نەوجەوانیدا بێت هەنگوینی دڵ خۆراکی گیان ئەمژیت.
بەڵام ئێستا کە هەچ قاقەزێک ئەکەیتەوە بە باسی مردنی تۆ بۆنی فرمێسکی لێ دێ. ئەی هوو خۆڕاگرتن چەند گرانە،؟
ئەوڕەحمان بمرێ؟
گەرمەی جوانی بژاکێ؟
ڕۆشنایی ژیان لە نیوەی ڕێگادا بکوژێتەوە؟.
نەوجوانی لەژێر پێی مەرگا بفلیقێنەوە؟
هەروا ئاگرم تێ بەرنەبێت ئەوڕەحمان!.
چۆن؟ ئێستا ئەم ئاسمانە شینە تۆی لە ژێرا نیت؟
ئەم هەتاوە نەرمەی پاییز لەسەری تۆ نادات؟
ئەم دنیا گەورەیە بە دووتا خوارو ژوور بکرێت هەرگیز نادۆزرێیتەوە؟
ئەی لە کوێیت؟
لە ژێر گلا؟ ئاخ!

× سەرچاوە : گۆران . . نووسین و پەخشان و وەرگێڕاوەکانی . . دەزگای ئاراس ساڵی ٢٠٠٢ .

# تاسەی هاودەرد

برا! دوو دڵی هاودەرد دوو پارچە گۆشتی هەژار بووین، لە کونجێکا پێکەوە ئەمان ناڵاند! هەردووکمان تەلیسمی ژیان دێوە ڕەشەکەی پیشان دابووین، لە عاسمانی هیوامانا ڕووناکی نەبوو، ئەستێرە کزۆڵەیەک چییە نەئەدرەوشایەوە.
دوو دڵ کە نیشانەی مانیان: ئازارێکی زۆرن لێدانێکی سستی بێ تین بوو، نازانم بە هۆی چ هەڵکەوتێکەوە بوو کە لە شوێنێکی کپ‌و کەلا لە قوژبنێکی بێدەنگی سلێمانیدا یەکانگیر بووین بە ناڵین، تاوێک بە سکاڵا تێ ئەپەڕان.
هەی داخ! وامان ئەزای کە لە دەریای کلۆڵیدا ناخمان گرتووە، ئیتر جێگای قووڵتر نەماوە تێی بکەوین. وەک پیشەی ئادەمیزادی گەوجە، هیچ نرخی ئەو نیعمەتەمان نەئەزانی کە لە قولی مستمانا بوو. پەنجەمان تەنیا سەر جێگای ئێش‌و ئازار ئەخست‌و ناوچاو و ژیانی خۆمان بە لەعنەت ئەکرد نەمانئەزانی ڕۆژێک ئەبێت تۆڵەی ژیان بەر چەپۆکمان بدا، هەر یەکە بە لایەکا تەفروتوونامان بکات.
برا! بە تەواوی بڕوام هەیە ئێستا تۆش وەکو من لە دنیادا نیعمەتێکی گەورە لەناو چاوی خۆت بخوازی:
تەنیا پێکگەیشتنەوەمانە کە ئەوسا ئەم پێکەوەبوونە دڵی هیچ کاممان زۆرو کەم دەربەستی نەبوو. ئاخ چەند خۆشە دوو هاودەرد لە قوژبنێکی کش‌و ماتا سەر بنێن بە سەری یەکترەوە، سکاڵای ئێش‌و ئەندێشەی خۆیان بکەن.
بەڵام ئەفسووس، وەکو منداڵێکی ساوا، ئەوسا زانیم چۆلەکەکەم زۆر جوانە کە لەدەستم فڕی‌و بە ناخی ئوفقی تەماویدا چووە خوارێ ئیتر ئێجگاری ون بوو.
ئێستا ڕەنگە منتق‌و لێکدانەوە بە کەلکی زیانی پاراوی ئامۆژگارێکەرێکی ساردو سڕ بێت، ڕەنگە ئاسان بێت خەڵق بڵێن: پاش ڕابردوو گریان بێ سوودە، بەڵام دڵێک کە بە ساجا چزاوە بەم دەرمانانە فێنک بێتەوە هەیهو...

گۆڤاری گەلاوێژ-کانونی یەکەمی ١٩٣٩

# کۆنی و تازەیی لە هەڵبەست

هاوڕێیەکی (هەڵبەست دۆست) جیاوازیی ناوەندی هەڵبەستی کۆنو تازەی لێ پرسیم، ئەوەی توانیم بە دەم وتم، بەڵام ئەو ئەوەندەی پێ بەس نەبوو، لێی خواستم لەم بابەتەوە شتێک بنووسم، بەوەشەوە نەوەستا ئەم خواستەی چەند جارێک دووبارە کردەوە.

**جیاوازی لە ناوەندی هەڵبەستی کۆنو تازەدا چییە؟**

ئەمە پرسیارێکە لە هەنگاوی یەکەمی سەرنجدا وەڵامەکەی زۆر ساکار دێتە بەرچاو، بەڵام پیاو هەتا وردتر ئەبێتەوە گیروگرفت لە ڕێی سەرنج زۆرتر سەر هەڵئەدا. ئەمجا لەگەڵ هەموو دیشوارییەک لە ماوەی بردنی ئەو شوێنەدا لە لاپەڕەی گۆڤارێکی وەک (هیوا)دا چنگ نەکەوێ، وەڵامی پرسیاری هاوڕێی خۆشەویست ئەخەمە بەرچاوی گشتی، نەک لەبەر پەرموونەوە بە توانستی خۆما، بەڵکو بەو نیازەی کە ئەم چەند دێڕە وەک سەرەتایەکی کردنەوەی باس بخەمە بەرچاوی ڕۆشنبیرەکانمان بۆ لێدوانو لێکۆڵینەوەو بۆ دۆزینەوەی وەڵامی وردترو نزیکتر لە ڕاستی، چونکە ئاشکرایە کە ئەم جۆرە پەیجوورییانە لە وێژەی کوردیدا شتێکە نەک هەر بە کەڵک، بەڵکو زۆریش پێویستە.

لە پێش هەموو شتێکا ئەبێ وەکو سەرەتایەک (مبدأ) ئەو ڕاستییە بخەینە بەرچاو، کە لە جیاکردنەوەی هەڵبەستی کۆنو تازەدا هەتا قەڵەمی درشت بگرین بە دەستەوە نیشانەکردنو دیاریکردنی سنوور ئاسانتر ئەبێ، بەڵام کە چووینە ناو باسی وردەکارییەوە شتەکان و بابەتەکان وا بەسەر یەکا ئەئاڵۆزکێنو تێکەڵ ئەبن، کە سەردەرکردن لە بڕیارێکی دڵنیایی-بەخش لە وزە ئەچێتە دەرەوە، بەڵام دروستە بۆ ئاسانکردن تەنیا بۆ سەردەمی درێژەکێشانی باسو بەراوردەکەمان چاو بپۆشین لەو نموونە دەگمەنانەو لە تایبەتییەکانی سەردەمو زرووفی دەستەی کۆنو تازە، جگە لەوەش چاو بپۆشین لە جیاوازیی مستەوای بەرهەمی تێکڕاییو تاکەتاکی هەردو لاشیان بۆئەوەی بتوانین بچینە بەراوردو سەرنجدانێکی واوە، کە سەرمان بۆ لێ دەربکرێ.

بەر لە گشت با لە (وێنە-شکڵەوە) دەست پێ بکەین، نەک لەبەر گرنگیی وێنە، بەڵکو لەبەر ئاسانتر بوونی بەراورد لە مەیدانی بابەتە درشتەکانی هەڵبەستا:

١. هەڵبەستی تازەی کوردی، بە زۆری چووەتەوە سەرکێش (وەزن)ە نەتەوەییەکەی حونجە- پەنجە (هیجا-مەقتەع) لە کاتێکا کێشی هەڵبەستی کۆن (عرور) بوو، کە ئێستایش هێشتا لایەنگیری لەناو بوێژەکان ماوە، کە ئەمانە لە سەرێکەوە کەمایەتین لە سەرێکیشەوە نوێنەری ڕێژگەیەکی کۆنن، جگە لەمە بوێژی بەناوبانگ مەولەویو بوێژەکانی تری شێوەی گۆرانی (هەورامی)یش بە عەرووز نا بە کێشێکی دە حونجە (هیجا)یی هەڵبەستیان داناوە.

٢. قاڵبی هەڵبەستی کۆن "قەسیدە، غەزەل، پێنج خشتەکی، چوار خشتەکی، تەرکیب بەند"... بووە، لە کاتێکا قاڵبی هەڵبەستی تازە ئەگەر لیریک (غنائی) بێ پارچەیەکی کورت، یان درێژ ئەبێ، کە پێک هاتووە لە ژمارەیەک بەندی دوو دێڕی یان ٣، ٤، ٥، ٦...تاد، کە قافیەی ئەم بەندانەش بە مەرجێک لە دوو دێڕی کەمتر نەبێ، بەڵێ بە جۆری جیاواز پێکەوە ئەبەسترێن، لە هەڵبەستی تازەدا وێنەی قاڵبی دراماتیکی هەیە، کە لە هی کۆنا نییە، بەڵام قاڵبی داستان (مەلحەمە)و هەڵبەستی چیرۆکی لە کوردیی کۆنو تازەدا - تێکڕا- وەکو یەکن.

٣. هەڵبەستی کۆن دوایی هەموو بەیتەکانی بە درێژەکێشانی قەسیدە یان غەزەل لەسەر یەک قافیە ئەڕوا، بەڵام یەک قافیە لە هەڵبەستی تازەدا دێڕەکان زۆرتر دوودوو ئەبەستی پێکەوە، لای ئەوپەڕی لە قافیەبەندی دێڕەکانی یەک بەند زیاتر تێناپەڕێ.

٤. لە هەڵبەستی کۆنا نرخی وێنە لە پێش نرخی ناوەڕۆک (محتوی)دا دێ، لەبەر ئەوە نیشانەی وشەبازی لە هەڵبەستی کۆنا زەق ئەکەوێتە بەر چاو- جیناس، لەفو نەشر...تاد، بەڵام لە هەڵبەستی تازەدا بە تایبەتی لە هی قوتابخانەی ڕیالیزمی تازەدا وشەبازیو زەڕکەشی کردنی ئوسلوب باوی نەماوە لە باتی ئەوە لەنگەری بایەخ پێدان خراوەتە سەر ناوەڕۆک.

٥. بایەخدان بە ڕازاندنەوەی وێنە لەگەڵ ئەو ماوە تەسکەی یەکیەتی قافیە دروستی ئەکا، هەڵبەستی کۆنی ناچار کردووە یەکێتی بابەت (وحدە الوجود) بترنجێنێتە ماوەی بەیتەوە. لە غەزەل یان قەسیدەیەکا بەیت لە واتا (معنی)دا ئەوەندە سەربەخۆیە، کە پیاو ئەتوانێ بەیتەکان بە هەوەسی خۆی پاشو پێش بخات، بێئەوەی هەست بە جیاوازییەک بکرێ، لە هەڵبەستی تازەدا یەکێتی بابەت دابەشکراوە بەسەر هەموو پارچە هەڵبەستەکەدا، لەبەرئەوە لە پارچەیەک هەڵبەستی تازەدا نەک هەر لەبەر جیاوازیی قافیە، لەبەر تێکنەچوونی ڕیزپێوەگرتنی بابەتیش زۆر گرانە تاقە دێڕێک چییە لە شوێنی خۆی بگوێزرێتەوە.

لە وێنەی وێژەییدا ئەمانە بوون (بە قەڵەمی درشت) جیاوازییەکانی ناوەندی هەڵبەستی کۆنو تازە، ئەمجا با چاوێک بگێڕین بە ناوەڕۆکا.

ئاشکرایە ناوەرۆکی هەڵبەستێکی لەم گەوهەرانە پێکدێت لە : بیر، ئەندێشە (خەیاڵ) هەست (عاطفە). هەرچی هەڵبەستی کۆنە لە بایەخدا هەستو ئەندێشە ئەخاتە پێش بیرەوە، لە کاتێکا هەڵبەستی هەرە تازە (ڕیالیزم) پایەی یەکەم بە بیر ئەدات، ئەمە سەرەڕای ئەو جیاوازیانەی لە ناوەندی چەندێتیو چۆنێتی ئەم سێ گەوهەر ( عنصر )ەدا هەیە لە هەردوو جۆری هەڵبەستا:

**بیر:**

بیری هەڵبەستی کۆن شەقڵی تایبەتی ڕژێمی دەرەبەگیی پێوەیە، لە سەرێکەوە ئایدیالی (مسالی)یە بەرامبەر بە ڕیالیستی بیری هەڵبەستی تازە. لە سەرێکی تریشەوە زۆربەی ئەم -کۆن- خۆیی (زاتی)یە، لە کاتێکا زۆربەی بیری هەڵبەستی تازە لە دنیای بابەتی (موضوعی ) وەرئەگیرێن، ئەگەرچی لە دەربڕینا ڕەنگی بۆتەی هونەریی بوێژ ئەگرێ.

بەها هونەرییەکانی سەردەمی دەرەبەگی سەر دەفتەریان پاڵەوان پەرستی بوو، پاڵەوانی بابەتی هەڵبەست سێ کوچکەی (یار)و (میر)و (پیر) بوو. سەرچاوەی بیرێک، کە وتەو واتای پیاهەڵدانی میری پێ ئەڕازایەوە ئەفسانە بوو، میر لەشی هەرە ساغی چوارپەلێکی ئیفلیجیش بوایە، هەمیشە بە زۆری بازوو ڕۆستەمی داستان، بە سێبەری دەرگا سولەیمانی زەمان، بە سامو شکۆ ئەسکەندەری ساحێب قران.

جادووکاریو تەلیسمەکانی ئەفسوونیش سەرچاوەی زانیاری بوون، بۆ هەڵبەستی ستایشی پیر، نوێنەری جوانییەکانی سروشتو ژور-سروشت هەموو، کە لای بوێژە دڵدارەکان یار بوو، ئەمیش (یار) زۆرجار پریشکی ئەفسوونو ئەفسانەی لێ ئەپژا، ئەبوو بە سەرکردەی لەشکرێک، کە برۆکانی دوو شمشێری تیژو برژانگەکانی ڕیزە تیری ناو تیردانو پرچی کەمەندی لەشکری دڵان بێ.

لە سەری ئەفسوونی پیریشەوە چاڵی چەناگەی بیری زەمزەم خاڵی ڕوومەتی زەنگی پەچەو سێبەری زوڵفی کافرستان، خەتی تازەی ڕووی ئایەتی قورئان بوو.

بوێژی تازە ئەو جووتە پاڵەوانەی دەمێکە ناشتووە، کە میرو پیر یان پێ ئەڵێن یاریشی ڕزگارکردووە لەو دەربڕین (تعبیر)ە بێزراوە، کە باڵا شۆخەکەی کردبوو بە سنگی دیوەخان، هەرچی چەکی ئاغا هەیە هەمووی پیا هەڵواسیبوو، لە هەڵبەستی کۆنا ئەوەی لە پاڵەوان بەجێهێنانی ئەخوازرا هەموو ئاواتو ئارەزووە



خۆییەکانی بویژ بوو. بەرژەوەندییەکانی خۆی بوو. ئیستا ئارەزووی ئاواتەکانی گەل، داخوازیو پێویستییەکانی کۆمەڵ لە پاڵەوانی هەڵبەست داوا ئەکرێ. پاڵەوانی هەڵبەستی تازەش تێکۆشەرە، تەنانەت یاریش بە جوانییە دڵ چەسپو سروشتییەکەی ئیستایەوە هاوبەشی خەباتی پاڵەوانە. ئەگەر ڕاستەوخۆ خۆی نەبێ، پاڵەوان!

**هەست:**

وەکو لەسەرەوە گەیاندمان، واز لە بەرهەمی بویژە بەرزە دەگمەنەکانمان بهێنین بە جۆرێکی جوێ کراوەیی و تەنیا لە نموونە بدوێین لە تێکڕای بەرهەمەکانی وێژەی کۆن، بە خەیاڵ لەسەر یەکتری کەڵەکەمان کردووە، ئەبینین ڕاستە ئەم بەرهەمە ژاوەی دێ لە جۆشی هەستا، بەڵام ڕەخنەگرەکانی وێژە ناونیشانی هەستی وێژەیی بەم جۆرە هەڵئەدەن: هەستی وێژەیی نابێ کەسیی (شخصی) بێتو تەنیا بە شوێن بەرژەوەندیی بویژ خۆیدا بسووڕێتەوە، دوایی نابێ هەستەکانی خەمو خەفەت بە جۆرێک بن. ژیان لەبەرچاوی مرۆڤ بکەن بە دۆزەخی ئازارو بێهیوایی. هەروەها هەستکردن بە جوانی ئەبێ لە سنووری تەسکی جوانییەکانی ئافرەتو سروشت ڕانەگیرێو پەرەی پێ بدرێ، تا ئەوپەڕی ڕادەی هەستکردن بە جوانیی بەرهەمێکی هونەری، یان ڕەوشتێکی جوان، یان بیرێکی بەرز یان خوویەکی شیرین، یان فرمانێکی بەکەڵک بەوێنەی -لەپێش هەموو شتێکا- کردەوەیەکی شۆڕشی خۆبەختکەرانەی تێکۆشەر.

جگە لەمەش ڕەخنەوانەکان شتێکی تریش ئەکەن بە مەرج بۆ بەهای ئیستەتیکی "القيمه الجماليه"ی هەست بە گشتی لە هونەرەجوانەکاناو بە تایبەتی لە هەڵبەستا هاوهەستی کردن لەگەڵ ژیان! واتە بە هەست لەگەڵ ئەو شتانە نەبین، کە ژیان لەبەرچاو ئەخەن، بەڵکو چێژ لەو شتانە وەرگرین، کە پترمان ئەنووسێنن بە خۆشیو شیرینیی ژیانەوە.

ئەم پێوانەیە لە بازاڕی هەستا ڕەنگە بەشێکی تازەی هەڵبەستی تازەش نەگرێتەوە، بەڵام هەڵبەستی کۆن بە زۆربەییەکی نزیک لە سەرجەم هەستی پێچەوانەی دەربڕینە بەرامبەر بە ژیان. لە ڕاستیشا ئەو شتەی پێی ئەڵێن (گیانی سەردەم) ماوەی نەداون بتوانن بە جۆرێکی تر تەماشای ژیانو دنیا بکەن.

**ئەندێشە:**

هەڵبەستی کۆن باڵی ئەندێشە (خەیاڵ)ی زۆر تیژ بوو، بەڵام ئەندێشە کاتێک نرخێکی هونەری ئەبێ. کە نیگارکێشی هەستە پەسەندەکانی لای سەرەوە بێ، ئەندێشەیەک پاڵەوانەکانی ئەسکەندەرنامەو دێوەکانی کێوی مازیندەران بهێنێتە دی، تەنیا ئەتوانێ هاوتەمەنو هاومێشکی منداڵ ژیرکاتەوەو هەرگیز ناتوانێ تینوێتی خاوەن چێژێکی وێژەیی بشکێنێ، ئەم جۆرە ئەندێشانە لە ڕیزی کەڵکەڵەو ئەوهامدا ئەژمێررێن.

لە جۆرەکانی ئەندێشەدا ئەوەی هەڵبەستی کۆن تیایا دەوڵەمەندە، ئەو جۆرەیە کە پێی ئەڵێن، ئەندێشەی لێکدانەوە (تەفسیری)، وەک لێچوواندنی چاو بە نێرگس، بەژن بە سەروی ڕەوان، ڕوومەت بە پەڕەی گوڵ، لە کاتێکا هەڵبەستی تازە بایەخ ئەدا بە ئەندێشەی داهێنەران، کە ئەم جۆرە ئەندێشەیە بەرهەمی سەرنجدانی بویژە لە دنیای جوانی، بەدرێژایی تەمەنی لە پاش ئەوە یەکخستنی ئەو هەستو بیرانەیە بە وێنەیەکی جوان لە قاڵبی پارچەیەکی هونەری، کە پێی ئەڵێن هەڵبەست.

جیاوازییە سەرەکییەکانی هەڵبەستی کۆنو تازە لە وێنەی هەڵبەستو لە ناوەڕۆکیا ئەمانەن، لە تەکنیکو یەکگرتنی گشتی (التركيب العام)ی هەڵبەستیشدا هەندێ بابەتی جیاوازی لە ناو کۆنو تازەدا هەیە، بەکورتی بیانخەینە بەرچاوی سەرنج بێ کەڵک نییە:

١. لە هەڵبەستی کۆنا شەقڵی لاسایی بە ئوسلوبەوە ئاشکرایە، لە قاڵبا کەس نەیویستووە لە نەریتی مامۆستا پێشەییەکان لابدات، غەزەل هەر ئەبێ ژمارەی بەیتەکانی تاک بێو لە (١٥) بەیت تێنەپەڕێت، قەسیدە ئەبێ لەسەر یەک قافیەی تەواو بێتو هەموو دەربڕینەکانی ئەبێ هەر کلێشەی پێشینان بن: نێرگسی شەهلاو هیلانەی سەمەندەر.

٢. لە بەرهەمی کۆنا ئەو ئارەقەی دانەر ڕشتوویەتی لەناو ڕازاوەیی هەڵبەستەکەیا دیارە، لە کاتێکدا کە بویژی تازە ڕەنجو ماندوبوونەکەی ئەشارێتەوە.

٣. بویژی تازە ئەوەندەی بویژی کۆن لە هونەریی یەکخستنی وشەو سفت-چنینی وتەدا وەستا نییە، بە تایبەتی شاعیرەکانی ئیستامان هێشتا لە دەوری تاقیکردنەوە تێنەپەڕیون، لە سەردەمێکیشا ئەژین، کە تەنانەت ئەو فەرهەنگەی وشەی لێ هەڵئەبژێرن بۆ بەرهەمیان هێشتا لە قاڵبا نەمەیبون. ئەم هۆیە دەستی زۆرە لەوەدا، کە شتی تازە زوو ئەتوانێ شوێن-پێ پتەو بکا لە مەیدانی هونەرەکەی خۆیا، بەڵام لەبەرئەوەی هێزێکی تازەیە ئەو شەقامەی گرتووە، کە کاروانی مێژووی بە سەردا پێش ئەکەوێ، لە ئەنجاما گرەو هەر ئەو ئەیباتەوە.

هیوا-ژمارە ٣١ ساڵی ٤
کانوونی دووەمی ١٩٦١



# ڕێگا سەختەکان

ڕێگا سەختەکان بەرهەمی چیرۆکنووسێکی ناسراوی ئەرمەنستانی سۆڤییەتییە، ناوی "ڤاختان ئەنانیان"ە، لە ساڵی (١٩٠٥)دا لە گوندێکی ناو چیای دیمەن جوانا لەدایک بووە، سەردەمی منداڵی لەو گوندە بچووکەدا ڕابواردووە، کە دارستانی چڕی شاخەکان لە هەموو لایەکەوە دایان پۆشیوە.

لە خوێندنەوەی چیرۆکە کورتەکانی "ڕێگا سەختەکان"، کە لە ڕووسییەوە کراوە بە ئینگلیزی، دەرئەکەوێ کە گوندەکەی "ڤاختان ئەنانیان" لە ناوچەی کوردەکانی ئەرمەنستاناو لە سنووری کوردستانی ئێران-تورکیاوە نزیکە، هەروەها وا دەرئەکەوێ، کە نووسەر بە هۆی مەراقی نێچیرەوانییەوە سەرو ساختێکی زۆری لەگەڵ ژیانی کوردی ڕەوەکی ئەو ناوەدا هەبووەو لە ناو شوانو ڕاوکەرە کوردەکانا ئاشنایەتی زۆری پێکەوە ناوە. لە ڕێکەوتی قسەدا بەکارهێنانی هەندێ وشەی کوردی کرمانجیش پیشان ئەدا، کە ئەو شێوەیە بگرە تا ڕادەیەکی باش ئەزانێ.

بۆ ئەوەی پایەی ویژەوانیی "ڤاختان ئەنانیان" ڕوون بکەمەوە، لە پێشا سەرگوروشتەی ژیانی ئەکەم بە کوردی، کە لە لایەن دەزگای چاپی زمانە بێگانەکانەوە لە مۆسکۆ لە بەرگی کتێبەکەیا نووسراوە، لە پاش ئەوەش ئەمجا ئەچمە سەر نیازی بنەڕەتیم لە نووسینی ئەم وێژانە.

"ڤاختان ئەنانیان" هەر لە منداڵییەوە بە ناسینو خۆشەویستی سروشت پەروەردە بووە، لەو تەمەنەیا هەرگیز تێری نەئەخوارد لە گوێ شلکردن بۆ داستانی عاشقە (شایەرە) بێ چاوەکان، یان بۆ سەرگوروشتەی ئەو ڕاوکەرە ئازاو چاو نەترساوانە، کە بە تاقە دەستێک پەلاماری ورچی کێوییان ئەدا، لە کاتێکا چەکی دەستیان لەو کوتەکە کۆنە پتر نەبوو، کە لە تەقەڵای پاسی ڕانە ئاژەڵدا لە چەند لاوە کەڵبەی گورگ کرۆشتبوویان، بۆ باسی ئەو کارەساتەی ڕابردووی دوور، کە ئاڵۆزکاوییەکانی خەیاڵی پیرەکانی لە هەندێکی چیرۆکەکانیا، بە ڕاستییەکی ڕووناکو بە داهێنانێکی جوان ڕازاندووەتەوە، ئەمانەش گشتیان مایەیەکیان لە شیعری دیمەنی (ڕێگا سەختەکانی چیا) خراوەتە سەر.

ئەنانیان یەکەم کتێبی "لەناو ئەڵقەی ئاگرا" لە ساڵی ١٩٣١دا دانا، لەو دەمەدا گەلێک چیرۆکی بڵاو کردۆتەوە، کە یەکێک لەم چیرۆکانە کراویشە بە فیلمی سینەما، بە تایبەتی چیرۆکەکانی سەرگوروشتەی لای منداڵانو لای خوێندەوارانی گەورەش وەکو یەک خۆشەویستن.

ئەم وەسفانەی لە کورتەی سەرگوروشتەی ژیانی "ڤاختان ئەنانیان"دا وتراون، لە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی "ڕێگا سەختەکان"دا زۆر بە ڕوونیو بە تیژی بەرچاو ئەکەون. شتێک لەم سەرگوروشتەیەدا ڕوون نەکرابێتەوە، لە باری سەرنجی خۆمەوە شەقڵە دیارەکانی ژیانی کوردی کوێستانە لە زۆربەی بەرهەمی نووسەردا وەک قسەی نەستەقی خۆمان ئەڵێ: "مشتێک نموونەی ئەمارێکە".

چیرۆکەکانی "ڕێگا سەختەکان" هەستی ئەوە ئەدەن بە پیاو، کە ئەنانیان بەرهەمی نووسینی لە کوردییەوە وەرگێڕێ بۆ زمانی ئەرمەنی، یەکێک لە چیرۆکەکانی ڕێگا سەختەکان، سەرگوروشتەیەکی سەمەرەیە: سلێمانە درێژ کۆنە ڕاوکەرێکی کورد، بۆی ئەگێڕێتەوە، کە پەشیمانی دەرئەبرێت لەو سپڵەکارییەی بەرامبەر بە ڕەشمارێکی خاوەن چاکە کردوویەتی، چیرۆکێکی نەختێک درێژە.

تۆڵە (إنتقام) سەرگوروشتەی زۆر سەمەرەتری ڕاوکەرێکی کوردە (داوود) کە ورچۆڵەیەکی ساوای لە کوشتن ڕزگار کردووەو پێی گەیاندووە، بە جۆرێک کە بووە بە هاوڕێی ساڵانی دوورو درێژی بە هەردو چیاکانەوە.

ئەوەی لەمە زیاتر سەرنجم ڕائەکێشێ چیرۆکێکە (تۆڵە)، کە بە دەستکاری لە ئەفسانەیەکی باوی کوردی وەرگیراوە، ئەمە ئەو بەیتە کوردییەیە کارەساتی باوکو کوڕێکی نێچیرەوان ئەگێڕێتەوە، کە یەکێکیان کەوڵ پۆشینی ئەوی تریان لە پارێزی نێچیریا سەری لێ تێک ئەداو تفەنگی پێوە ئەنێو ئەیکوژێ.

ڤاختان ئەنانیان، ئەمەی بە جۆرێک دەستکاری کردووە، کە بنەڕەتی چیرۆک نەگۆڕاوەو لەگەڵ ئەوەش ناوەرۆکە کۆنەکەی ئاراستەیەکی تازەی پێشکەوتووانەی وەرگرتووە. لێرەدا سروشتییە قسەم لەسەر ئەوەیە، کە ئەم چیرۆکە لە هەمان بەیتی لای ئێمە وەرگیراوەو لە زمانی نەتەوە دراوسێکانیشمانا جۆری تایبەتی خۆیان لەناوا ئەبێ، هەرچۆنێک بێ، بێ سوودم نەزانی ئەم چیرۆکە کورتە بکەمەوە بە کوردیو بیخەمە پێش چاوی ڕۆشنبیران، بەو نیازەی کە بانگیان کەم بۆ سەرنجدان لە ڕچەیەک لەو ڕچانەی ئەگونجێ بتوانین بۆ ژیاندنەوەو نوێکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی پیایانا بڕوین.

**ئازادی ژمارە ٥٦ ساڵی دووەم ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٦٠**

## بەردە نووسێک

لە شاخەکانی کوردستان، لە شوێنێکا کە ئەکەوێتە سەر سنووری عێراقو ئێرانو تورکیا، بەردێکی پانی گەورە نزیک بە سەرچاوەی چەمێک کەوتووە، لە ساڵانی زۆر لەمەو پێشەوە نووسینێک لەسەر ئەم بەردە هەڵکەنراوە، کە ئێستاش بە ئاسانی ئەخوێنرێتەوە، سووڕانەوەی دوورودرێژی گەردوون ئەو بەردەی تا ئەمڕۆ نەسواندووە، وا دەرئەکەوێ لەمەو پاشیش هەرگیز ناتوانێ بیسووێنێ.

دانیشتوانی دێهاتی نزیک بەو شوێنە، لە بارەی ئەم بەردەوە دەماودەم ئەفسانەیەک بۆ میوانەکانیان ئەگێڕنەوە، ئەمانە ئەڵێن: لە ژێر ئەم بەردەدا ڕاوکەرێکی کۆن لەناو گڵایە، کە ناوی لە بیری کەسا نەماوە، ڕاوکەرێک بووە، کە لە سەردەمی خۆیا ناوبانگی بە هەموو لایەکا بڵاو بۆتەوە، لە کاتی ڕاوا هەر نێچیرێکی بەدی

کردبێ، باڵدار بووبێ یان خاڵدار لە دەستی دەرنەچووە.
ئەم ناوبانگەی ئەوەندە حیرسی زۆر کردبوو. هەرگیز نەیئەتوانی لە ئاوەدانیو لە ناو ماڵو منداڵی خۆیا ئۆقرە بگرێ، هەمیشە بە هەردو چیا سەختەکانەوە ئەسووڕایەوە. ڕۆژێک کە بۆ تاوێکی کورت لە ماڵەوە پشووی ئەدا، ڕووی کردە منداڵەکانیو وتی:
ئافرەت! ئەوەی ڕاستی بێ. بێزار بووم لە ڕاوکردنی کەڵەکێوی کوشتن، ئەمەوێ لەمەو پاش بە زیندوویی نێچیر بگرم.
لە پاش ئەم قسەیە زۆری پێ نەچوو دەستی دایە ڕەزمو تفەنگەکەی بەرەو چیا ملی ڕێی گرت.
بە هەردێکەوە کەڵە کێوییەکی چاو پێکەوت، تا هەلی لێ هەڵکەوت کوشتی پێستەکەی بە شاخو کەللەوە دەرهێنا، ئەمجا سەرتاپا هەڵی کێشا لە لەشی خۆی، کە هەردو دەستی خستە سەر زەویو لەسەر چوارپەل وەستا دڕۆزنیش نەی ئەتوانی لە کەڵەکێوی جویێ بکاتەوە، لە پاش ئەوەی بەم جۆرە خۆی گۆڕی، ڕووی کردە ڕانێکی بزنە کێوی، کە بە سەختییەکەوە خەریکی لەوەڕ بوون، ڕۆژەکە ڕۆژێکی تەمو مژ بوو، نێچیرەوان لە ڕانەکە تەواو نزیک بووەوە، لەوەدا بوو ئێستا نا تاوێکی تر دەستی بگاتە نێچیرەکەی، بزنە هەژارەکانیش هەستیان بە هیچ تالووکەیەک نەکردبوو، بێ خەم، بێ خەم ئەلەوەڕان.
هەر لەهەمان کاتدا ڕاوکەرێکی تریش بە تفەنگێکی دوو لوولەوە لە پارێزگرتنا ئەبێ بۆ هەمان ڕانە بزن، کەڵێکی زەلام و قەڵەو بەدی ئەکات لە پەڕی ڕانەکەوە، ئەوەندە زەلامی دێتە بەرچاو باوەڕ ناکات بە یەک گوللە بۆی بکەوێ، لەبەرئەوە دوو فیشەکی بە جارێک بۆ ئەخاتە لوولەی تفەنگو نیشانی لێ ئەگرێت. بە یەک جار دووکەڵو دوو تەقە لە دەمی تفەنگ دەرچوو، کەڵە کێوی کەوتە تەقڵەلێدانو بە دەنگی مرۆڤ هاواری لێ هەڵسا: ئاخ... کوژرام کە ڕاوکەری دووەم گەیشتە سەری، هێشتا نووزەی تیا مابوو، تەقەکەرەکە پێی وت:
ماڵوێران ئەم کەوڵەچی بوو لە بەرتا، بۆچی خوێنێکی ناڕەوات کردە گەردنم؟
کابرا بەو نووکە گیانەوە کە تیا مابوو، سەرگوروشتەکەی خۆی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە ، تێی گەیاند، کە بابیبوون حیرسی زۆرە، بوو بەهۆی ماڵوێرانبوونی.
لە پاش ئەوە گیانی دەرچوو، ڕاوکەری دووەم هەر لەو شوێنە کردی بە ژێر گڵەوەو ئەو بەردە زلەی کرد بە کێلی ژوور سەری. لە پاش ئەوەی ئەم چەند وشەیەی لێ هەڵکەند:
ئەوی پێستی خۆی ئەگۆڕێت، بەشی سەر دڵی دوو گوللە ئەبێت.

**ئازادی ژمارە ٥٦ ساڵی دووەم - ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٠**

# سریالیزم (ما فوق الواقع)



ئادەمیزاد دیلی کۆمەڵ بووەو ئەو شتانەش، کە دەری بڕیوە لە سەروو کۆمەڵەوە نەبووە، ئەو شتانەی دەری بڕیوە لەو چوارچێوەیە نەچۆتە دەرەوە، ئەوانەی سەر بەم قوتابخانەیەن ئەیانەوێ ئەدەب بکەن بە دەربڕینی ئەو هەستە تایبەتییەی، کە شاراوەتەوە، کە بەرهەمی تایبەتیی ساتێکی ئیلهامە بێنەوەی خۆیان ببەستنەوە بەو یاساو ڕەوشتو ڕێبازە ئەدەبیانەوەی کە باو بووە.

بەم جۆرە بەرهەمی ئەم شاعیرو نووسەرانە لە شتێک ئەدوێ، کە هەموو کەسێک هەستی پێ ناکات، بەڵام بە لای ئەمانەوە زۆرتر ئەو واقیعە دەرئەبڕێت، کە کۆمەڵانی خەڵکی تیا ئەژین، لەم بابەتەوە هەندێ لەم نووسەرو شاعیرانە توانیویانە بەرهەمی وا ڕەسەن بنووسن، کە باسی هەستێکی پەنگخواردوی شاراوە ئەکاتو توانیویەتی هاوبەشیی خۆی بکات لە پێشکەوتنی ئەدەبی ئەو میللەتانەدا، بە تایبەتی لە ئەدەبی فەرەنسیو ئینگلیزیدا.

هەروەها بە لای ئەم شاعیرانەوە بەرەڵڵاکردنی ئەم جۆرە هەستە، ئەبێتە هۆی ئەوەی، کە ئەدەب لە تازەکردنەوەیەکی بەردەوامدا بێت، هەر وشەو ڕستەو دەربڕینێک هەڵمەتێک بێت بۆ دۆزینەوەی ڕاستی، ئەو ڕاستییەی کە بەلای ئەمانەوە زۆر شاراوەترە لەوەی کە بە ئاسانی دەری ببڕێت بۆیە نوێخوازی لە ئەدەبی سریالیدا یەکێکە لە مەرجە هەرە گرنگەکان، کە داوای ئەکرێت، ئەم تازەکردنەوەیە، بە جۆرێکە کە هەر شاعیرو نووسەرێ توانای تایبەتیی خۆی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لە هەموو بەرهەمێکدا جۆرە هونەرێک بەکار بێنێت، کە لەمەوبەر نووسەرو شاعیرانی تر بۆی نەچوون.

سریالیزم زیاتر بەری نووسەرانو شاعیرانی ئەو میللەتە پێشکەوتوانەیە، کە بە تاقیکردنەوەیەکی گەلێ دەولەمەندا تێپەڕ بوون، قوتابخانەی ڕۆمانتیکیو ڕەمزییان بە شێوەیەکی پێگەیشتووانە تا ڕادەی ئەو تێگەیشتنە، کە ڕازی بن بە میراتی پێشوو، پێ گەیشتوە، هەوڵ بۆ ئەوە ئەدەن ئەم هەنگاوە تازەیە وەک تاقیکردنەوەیەکی نوێ بێ لە قۆناغێکی نوێدا.

**لە کتێبی " گۆران " نووسین و پەخشان و وەرگێڕانەکانی . . ئامادەکردنی : ئومێد ئاشنا . دەزگای ئاراس ساڵی ٢٠٠٢**

# هەڵبەست

**پێکهاتووە: ١- پەخشان. ٢- هەڵبەست.**

لە وێژەی کوردیدا پەخشان زۆر کەمەو لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بە تایبەتی لە چارەکە سەدەی دووەمییەوە دەستی کردووە بە سەرهەڵدانو گەشەکردن، بەڵام هەڵبەستی هونەری بۆیە پێی ئەڵێن هونەری، سەرەتای ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هەزار ساڵ لەمەوبەر، سەردەمی "عەلی تەرموکی" لە شێوە زمانی کرمانجیدا سەردەمی داهێنانی هەڵبەستە ئایینیەکانی شێوە زمانی گۆرانیو سەردەمی "بابەتایەری هەمەدانی"، کە لە وێژەی فارسیدا بە "بابەتایەری عوریان" بەناوبانگە، ئەمجا لەبەر ئەو بایەخەی هەڵبەست لە مێژووەکەمان هەیەتیو لەبەر ئەو جێگا زۆرەی لەناو بەرهەمی وێژەییمانا داگیری کردوە، لە سەرمان پێویستە لێکۆڵینەوە لە هەڵبەست پێشتر خەین، بایەخی گەورەتری بۆ تەرخان بکەین.

## هەڵبەست چییە؟

پێشینان ناونیشانی هەڵبەستیان بە کێش و قافیە هەڵداوەو وتوویانە: "هەڵبەست ئەو قسانەیە، کە کێش و قافیەیان هەیە". بەم پێیە ئەبێ فەرهەنگ، عەرەبی و کوردییەکەی بەدەن: قالب، اسم: ناو... بە هەڵبەست دابنرێ، ئاشکرایە ئەم قسەیە هۆنراوەیە، نەک هەڵبەستی ڕاستەقینە، هەڵبەستی ڕاستەقینە سەرەڕای هۆنراوەیی وشەکان ئەبێ واتاکەشی پەتی نەبێ لە گەوهەرەکانی هونەر "ئەندێشە، خەیاڵ، هەست" پێشینان لە دانانی تەعریفی لای سەرەوەدا تەنیا سەرنجیان لە دیمەنی دەرەوەی هەڵبەست لە قاڵبەکەی داوە، ئەگینا قسەی هۆنراوەی بێبەش لە هەوێنی گەوهەرەکانی هونەر تەنیا لەبەرئەوەی کێش و قافیەی هەیە، هەرگیز بە هەڵبەست دانانرێ، هەروەها قسەیەکی پەخشانیش هەرچەند پڕ بێ لە هەوێنی هونەری، بەمەرجێک کێش و قافیەی نەبێ، فراوانتر بدوێین بێبەش بێ لە جۆرێک ئاهەنگ و مۆسیقای تایبەتی، ئەو قسەیەش پێی ناوترێت هەڵبەست، بەوێنە ئەم قسانەی لای خوارەوەش:

(یار نوستبوو، لە ژوور سەریا هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا، بای هەناسەم زوڵفە ڕەشەکانی لە ڕووی ڕووناکی لادا، بەڵام داخەکەم! چاوە مەستەکانی نەکردەوە... ئەوەندە بێناوچاوبووم... لەگەڵ ئەوەی کزەبای بەیان هەڵی کردو تاریکیە خەستەکەی شەوی تەران، کەچی ئەو دوو نێرگزە جوانەی ئەو هەر نەکەشایەوە..).

گەر (نالی) هەر بەم جۆرە بیخستایەتە سەر کاغەز پێی ئەوترا بەرهەمی وێژەیی یان پارچەیەک پەخشانی جوان، چونکە لە هەموو جۆرەکانی هەوێنی هونەردا بەشدارە: بیری ورد، خەیاڵی جوان، وێنەو نیگاری ڕەنگین..هتد، بەڵام هەرگیز هەڵبەستی پێ نەدەوترا، تا بەم جۆرەی لای خوارەوە لە کێش و قافیەیەکی تایبەتیدا نەیهۆنیایەتەوە:

هەناسەم زوڵفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنگوت و شەو ڕابورد، دوو نێرگس هەر لە خەودا بوو

مەرجی هەڵبەست تەنیا کێش و قافیە نییە، بەڵام هەبوونی مۆسیقایەکی ڕەوان و جۆرە کێش و قافیەیەک، بە تایبەتی "کێش" هەرە گرنگی پێویستییەکانی هەڵبەستە، ئەمجا ئێمە لە پێش ئەوەدا لە بنچینەی باسی هەڵبەستەوە، وەکو جۆرێک لە جۆرە گرنگەکانی وێژە بە پێویستی ئەزانین کەمێک لە جۆرەکانی کێشی کوردی بکۆڵینەوە، دوای ئەوەش چاوێکی تر بە باسی قافیەدا بگێڕین.

## لە هەڵبەستدا کێش:

کێش لە هەڵبەستی زمانە جیهانییەکاندا، لە هەموو زمانەکانی دنیادا هەڵبەت هەیەو هەڵبەستی هەر زمانەیش بەپێی تایبەتییەکانی (خصائص)ی خۆی جۆرە مۆسیقایەکی جیاواز لە مۆسیقاکانی پەخشانی هەیە، ئەو مۆسیقایەی هەڵبەست کە بە عەرەبی "وەزن"ی پێ ئەڵێن و ئێمە لە کوردیی تازەدا وشەی "کێش"مان بۆ داناوە، ئەگەر بێت و چاو بە کێشی هەڵبەستی زمانە پێشکەوتوەکانی کۆن و تازەی دنیادا بگێڕین، ئەبینین چی لە ناو گەلانی ڕۆژئاوادا کێشی هەڵبەست لە ڕێکخستنی قسە پەیدا بووە، لەسەر بنەڕەتی دەستە دەستەکردنی دەنگەکانی بە دانانی شوێنی پشوودان لە ناوەندی هەموو ریزە ڕستەیەکدا، ئەم دەنگە دەستە دەستەکراوانە لە عەرەبیدا "تفعیلە"و لە زمانەکانی ڕۆژئاوادا (پێ)یان پێ ئەڵێن. کورد بە جۆرێکی ڕێکەوت لەم ناوەدا گەلێ "عەفەوی و شەعبی" نزیک کەوتوونەتەوە لە دۆزینەوەی زاراوە (اصطلاح)ە ڕۆژئاواییەکە لە تێکڕا کە جۆرێک لە جۆرەکانی هەڵپەرکێی ناو ناوە "سێ پێیی" ئەم دەستە قسانە کە لەمەو پاش "پێ"ی هەڵبەستیان پێ ئەڵێن لەسەر بنەڕەتی برگەکانی دەنگ ڕێکخراون، بەڵام هەر زمانە بە پێی تایبەتییەکانی (خصائص)و جیاوازییەکی خۆی لە ژماردن و پێوانە ڕیزکردنی برگەی دەنگ و ڕێگایەکی تایبەتی بۆ خۆی گرتووە:

١- بە وێنە: زمانی یۆنانی کۆن و لاتینی بۆ ڕیزکردنی قسە، لەسەر پێی هەڵبەست بایەخیان بە کورتی و درێژی برگە داوە لە یەک "پێ"داو برگەی درێژ یان بە پێچەوانەوە دوو برگەی کورت و برگەیەکی درێژیان کۆ کردۆتەوەو چەند پێیەکی وەک یەکتریان لە دێرێک وا ڕیز کردووە، لەم ڕێگایەوە، جۆرە کێشێکی هەڵبەستیان دۆزیوەتەوە پێوانەی درێژ و کورتی برگەشیان لەسەر ئەم شێوازە (قاعدە) داناوە:

١- برگەی درێژ پیتێکی دەنگی لەگەڵ بزوێنەرێکی درێژ (ئەی، ووس) یان دوو پیتی دەنگی لە ناوەڕاستیانا بزووێنەرێکی کورت یان درێژ (باز، بەز) یان لە پاش پیتێکی دەنگی بزووێنەر، دوو پیتی دەنگی (بەرز، ئارد، ماست) یاخود لە پاش پیتێکی دەنگی و پیتێکی بزوێنەری کورت یان درێژ پیتێکی دەنگیی تێکەڵاو (مرکب) وەکو (نگ) لە (جەنگ)دا...هتد.

٢- وێنەی جۆرێکی تری کێش، هی هەڵبەستی ئینگلیزی و ئەڵمانی و ڕووسییە، کە لەم زمانەدا (پێی) هەڵبەست لەسەر بنەڕەتی درێژ و کورتی برگە نا، لەسەر بنەڕەتی قورسی و سووکی برگە دروست ئەکرێ.

چونکە لەم زمانەدا لەنگەرێکی قورسایی قسە هەیە، ئەخرێتە

سەر برگەیەکی دیاریکراوی (معین)ی وشە، ئەم قورسایییە لە ئینگلیزی (ئەکسەنت)ی پێ ئەڵێن، وەرگێراوەکەی بە عەرەبی (ئیرتیکاز)ی پێ دەڵێن، بە فارسی (تەکیە)یە بەو پێیە لە کوردیدا وشەی (لەنگەر) ئەتوانێ شوێنی واتاکەی پڕ بکاتەوە لە کێشی ئەم زمانەدا. برگەی لەنگەری جێی برگەی درێژو برگەی بێ لەنگەری جێی برگەی کورت ئەگرێتەوە، بە وێنە لە ئینگلیزیدا چوار جۆری بنجی (اصلی) کێشی هەڵبەست هەیە، پێیەکان بەم ڕەنگە لە برگەی قورس‌و سووک ڕێک ئەخرێن:

١- قورس+سووک.
٢- سووک+قورس.
٣- سووک+سووک+قورس.
٤. قورس+سووک+سووک.

٣. جۆری سێهەم لە کێشەکانی هەڵبەست وێنەی لە زمانی فەرەنسیدا بەرچاو ئەکەوێت، زمانی فەرەنسی هەرچەند لە بنەڕەتا لە دایکە زمانی لاتینی زاوە. بەڵام لە ئەنجامی گۆڕان بەسەر هاتنی مێژوویدا هەم برگەکانی لە وشەی پێوانەدا لە یەکتری نزیک بوونەتەوە، هەم لەنگەری دەنگیشیان لەسەر لاچووە، لەبەر ئەوە لە زمانی فەرەنسزیدا کێشی هەڵبەست لەسەر مۆسیقایەکی خاوترو ڕەواتر دائەڕێژرێ لەبەرئەوەی لەم زمانەدا بۆ دروستکردنی کێشی هەڵبەست پێویست نەماوە بە حیساب ڕاگرتن بۆ درێژی‌و کورتی، یان قورس‌و سووکی برگەکانی وشەکانی لە ڕیزکردنیانا، لە یەکە یەکەی پێیەکانی هەڵبەستا، بە وێنە درێژە هەڵبەستێک (مصرعێک) لە کێشی ئەسکەندەری کە دوانزە برگەیە پێویستە هەر سێ برگەیەک بخرێتە پێیەکەوە.

بەم جۆرە "چواری" لە درێژی هەڵبەستەکەدا ڕیز بکرێ تەنیا ئەوە هەیە بۆ ئەوەی جۆرە ترپەیەکی سووکەڵە لە مۆسیقای هەڵبەستدا پەیدا ببێ لەنگەرێکی دەنگ ئەخرێتە بەر دوابرگەی هەموو پێیەکەوە. دوا برگەی هەموو دێرە هەڵبەستێک، کە ئەم لەنگەرە لەنگەری هەڵبەستی پێ دەڵێن‌و جیاوازە لەو لەنگەرەی لە هەندێ زمانا ئەخرێتە سەر برگەی وشەوە.

**کێشی هەڵبەست:**

لە هەڵبەستی تازەی زمانی کوردیدا دوو ڕێچکەی جیاوازی کێش هەیە:

ڕێچکەی یەکەم، ئەو بوێژانە لەسەری ئەڕۆن، کە پەیڕەوی بوێژە کۆنەکانمان ئەکەن، کە لە سەردەمی زۆر کۆنەوە لە ڕێگای وێژەی فارسییەوە هەندێ دەریایان لە کێشی عەروزی عەرەبییەوە وەرگرتوە، کێشی عەروزی عەرەبی‌و ڕۆژهەڵاتناسەکان‌و زاناکانی عەرەب وەک یەکگرتوو وان لەمەدا لە بنەڕەتا لەسەر حیسابی چەندێن "برگە"، واتە درێژی‌و کورتییەکەی دروست بووە، کت‌ومت وەکو کێشی هەڵبەستە لە زمانی یۆنانیی کۆن‌و لاتینی.

ڕێچکەی دووەم، ڕێچکەی بوێژە تازەکانەو لەسەر بنەڕەتی ژمارەی برگە ئەڕوا، لە هەر پێیە درێژەکانی هەڵبەست بە وێنەی کێشی فەرەنسزی، کە لە دەرسی پێشوودا بە نموونە هێنامانەوە بۆ جۆری سێهەم‌و کێشەکانی هەڵبەستی جیهان، هۆی گرنگیی ئەم ڕێژکەیە لە لایەن بوێژە تازەکانەوە بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتییە لە ناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا دەستێکی گەورەی تیا هەیە، لە سەرەتای ئەم سەدەیەی ئێستاو لە ناو تورکە عوسمانییەکاندا جووڵاندنەوەی تورکاندنی (تتریک)و هەموو دەزگاو ڕواڵەتەکانی کۆمەڵایەتی کەوتبوونە گوڕسەندن. تێکۆشین هەتا بڵێی گەرم بوو بۆ گۆڕطینی ئەلفوبێ‌و بۆ بژاردنی زمانی تورکی، بۆ بادانەوە لە هەڵبەستا لە کێشی عەروزەوە بۆ ئەو کێشەی تورکییە گەلانییە، کە عوسمانییەکان خۆیان (کێشی پەنجە یان کێشی هیجا)یان پێ ئەوت.

ئەم تەقەلایە گۆڕانێکی سروشتی بوو، کە سەرنجی ڕۆشنبیرەکانی کوردی ناو سنوری دەوڵەتی عوسمانی ڕابکێشێت، ئەمانیش هەر لەو سەردەمەوە وردە وردە کەوتنە بایەخدان بەم باری سەرنجە تازەیە بەرامبەر بە بەرزەوەندی نەتەوایەتی (مەلامحی قەومی)و ژیانی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی بوێژەکان لە ماوەی بۆلوانیا بە سووری (گەرمی) دەستیان دایە چاوکێران بە شوێن کێشی تایبەتی نەتەوەیی کوردا، ئەمانە بۆ کەیشتنی زوو بە ئامانج لە لایەکەوە فۆلکلۆرە ڕەنگینەکەی گەلی کورد بە گشتی لە لایەکی ترەوە کێشەی دە برگەییەکەی هەڵبەستی گۆرانی "شێوەی زمانی گۆران" بە هونەرە بەرزە جوانەکەی "مەولەوی"یەوە ڕێگای ئارەقرشتنی بۆ ئاسان کردن.

لە چاو ئالەباری زرووفا لە سەردەمی چەند دەستەساڵێکی کەما (عشرات من السنین) هەم چەشنی جۆرێکی کێشی نەتەوەیی ڕەسەن (اصیل) دۆزرایەوە، هەم لە ڕێگای لێکدانی ئەوانەوە چەند جۆرێکی (تازە داهاتوویش) هێنرایە کایەوەو لەم ڕێگایەوە لە زمانی کوردیدا تا ڕادەیەک لەسەر بنەڕەتی کۆنی ناو گەلێ ڕێچکەی دووەم کرایەوە، کە بریتییە لە ڕێکخستنی ئەوەندەی یەکتری ژمارەی برگە لە هەر پێیە لە دێری هەڵبەستا. وەکو لە پێشەوە باسمان کرد. ئەم جۆرە کێشە لە کوردیدا ئەتوانین ناوی "کێشی برگەیی" لێ بنێین.

**کوردو کێشی برگەیی:**

بۆ ئەوەی ڕادەی پەیوەندیی کێشی برگەیی بە هەڵبەستی زمانی کوردییەوە تێبگەین، پێویستە سەرنجی پشکنین بگرینە دوو **ئاراستەی جیاواز:**

یەکەم: ئەو بەرهەمەی لە وێژەی شێوەی گۆرانی‌و لە فۆلکلۆری نەتەوەییدا ئێستا بە دەستەوەیە.

دووەم: ئاوڕدانەوە بەرەو پاش بە مێژوودا ئەوەندەی لە وزەدا بێت بۆ

ئەو سەرچاوانەی، کە زمانو ویژەی کوزدیی ئێستایان لێ پەیدا بووە، لە باری کێشو ویژەی گۆرانی، کە لەناو کوردی عێراقدا لقی هەورامییان زۆرتر ناسراوە بە هەڵبەستی هونەریو فۆلکلۆرییەوە، کە لە کێشدا تاقە جۆرێکی هەیە ئەویش کێشی زانراوی دەبیە (٥ بە ٥)، کە بریتییە لە کێشی هەڵبەستی نەتەوەیی، با ئەم دوو دێڕە هەڵبەستەی لای خوارەوە لە بارەی کێشەوە بخەینە بەر لێکۆڵینەوە:

چون دیوانی شوور ئازیز نە سەردا
شەتاو سەر هۆر کرت وە دەشتو دەردا

لە خوێندنەوەی ئەم دێڕانە بەدەنگی بەرز بە ئاسانی بۆمان دەرئەکەوێ کە قورساییەک ئەکەوێتە سەر وشەی "شوور" لە دێڕی یەکەمو سەر وشەی "گرت" لە دێڕی دووەمدا، دوا بە دوای ئەو قورساییەش "لەنگەرەکەشی" وەستانو پشوودانێک لە خوێندنەوەدا ڕوو ئەدا، هەمان لەنگەرو پشوودان، لە پایانی هەردوو دێریشدا دوا بە دوای وشەکانی "سەردا"و "دەردا" هەستی پێ ئەکرێ، لەم شوێنو پشوودانانە شوێنی دیاریکردنی (پێ)یەکانی هەڵبەستن بە وێنە:

دێڕی یەکەم لە دوو "پێ" (چون دیوانی شوور)، و (ئازیز نە سەردا). دێڕی دووەمیش لە دوو "پێ" (شەتاو سەر هور گرت)و، (وە دەشتو دەردا) دروست بووە. ئەمجا ئەگەر بڕگەکانی ئەم (پێ)یانە هەر چواریان جیاجیا بژمێرین ، سەرنج لە جۆری ڕیزکردنی درێژو کورتەکانیان بدەین بە دەستووری لای خوارەوە: (چون دیوانی شوور ئازیز نە سەردا) (شەتاو سەر هۆر گرت وە دەشتو دەردا) بۆمان ڕوون ئەبێتەوە، کە هەر پێیە لە پێنج بڕگە پێک هاتووەو کورتیو درێژیی بڕگە لە ناو ڕیزی (پێ)یەکانا هیچ جۆرە حیسابێکی بۆ ڕانەگەیەنراوە.

بە وێنە "پێ"ی یەکەم لە پێنج بڕگەی درێژ دروست بووە ، بڕگەی کورتی هیچ تێ نەکەوتووە، لە کاتێکا بەرامبەر بەو لە دێڕی دووەمدا "پێ"ی دووەم لە دێڕی یەکەما تەنیا بڕگەی سێیەمی کورتە، کەچی بەرامبەر بەو "پێ"یەی دووەمی دێڕی دووهەم جگە لە بڕگەی سێهەمی بڕگەی یەکەمیشی هەر کورتە.

هەر لەم کێشە ژمارەیەک دێرە هەڵبەستی تریش تەماشا بکەین جیاوازییەکی زۆر ئەکەوێتە بەر سەرنجمان، هەم لە نیسبەتی ژمارەی بڕگەی کورتو درێژی پێیەکان، هەم لە گۆڕینی لە ناو دوو ڕیزی دوو پێی بەرامبەر بە یەکترا، ئەم درێژەیەی لە سەرەوە دامان لە بارەی تایبەتیو نیشانەکانی کێشی دەیی "١٠" گۆرانییەوە هەموو جۆرە کێشەکانی ناو هەڵبەستی فۆلکلۆری کوردی ئەگرێتەوە، کە هەرە باوەکانیان دوای کێشی هەشتیو (چوار بە چوار)و کێشی حەوتی (چوار بە سێ)ن. ئەمە بە مەرجێک ئەو کێشەی حەیرانو لاوکی لەسەر دانراوە بخەینە لاوە بۆ لێکۆڵینەوەی سەرنجێکی سەر پێیی وەک لە خوێنانەوەی هەڵبەستی ئاساییان دەست ئەکەوێ بە دوو ئازناوی (لەنگەر) دەورێکی هەبێت، لە دروستبوونی مۆسیقایانا.

**ئاوڕێک بەرەو مێژوو**

ئێستا لە ناو ڕۆژهەڵاتناسەکانا گومان لەوەدا نەماوە کە کوردی یەکێکە لە خێزانی زمانەکانی ڕەگەزی ئاریو لە زمانی فارسیی ئێستا کۆنترە، تەنانەت ئەوانە لە شێوەکانی زمانی کوردیدا شارەزاترن، باوەڕیان وابوو لەوە ئەچێ، کە کۆڕی تایبەتیی نیشانەکانی لەگەڵ شێوە زمانەکانی تر زیاتر پاراستووەو بەرامبەر بە زمانە کۆنەکانی پێش پەهلەویش هیچ نەبێت ئەوەندەی ئەم فارسییە مافی هەیە بۆ داوای نزیکیو لێچوون. ئەمجا ئێمە لە کاتێکا لە سامانی وێژەیی زۆر کۆنمان هیچمان بە دەستەوە نەبێت ئەتوانین بە لێکۆڵینەوە لە چۆنێتی کێشی هەڵبەستی کوردی پەنابەرین بەو سامانەی لە ویژەی زمانە کۆنەکانی ئێران بەجێماوە، مایەی سوپاسە کە لەو زمانانە دوانیان:

١- پەهلەوی بە هەموو شێوە زاراوەکانییەوە، ئەو شێوە زمانەی کە لە ئاڤێستا بەشی "گاتەکان"ی پێ دانراوە، ئەم دوو زمانە هەریەکەیان کۆمەڵێک هەڵبەستیان لە پاش بەجێ ماوە، کە ئەمە لە سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسە پسپۆڕەکانەوە ڕێگای گەیشتنی ئێمەی ئاسان کردووە، بەو نیازەی کە پێویستمان بۆ لێکۆڵینەوە بە پێی سەردەمی مێژوویی، با لە پێشا لە هەڵبەستەکانی ئاڤێستا بدوێین. لە زمانی ئاڤێستاو وشەی "گات" بە واتای سرود-گۆرانیو "چس تشتی" واتای هەڵبەست "مسلحەت جووت دێری هەڵبەست بێت"و "وچ" یان "واژە" واتای "وشە" ئەکرێتەوە، بەو پێیەی پسپۆڕەکانی ئاڤێستاناس ساغییان کردۆتەوە، دەستووری هۆنینەوەی "نقم"ی هەر پێنج بەشەکەی "گاتەکان" بەم جۆرەیە:

١- بەشی "ئاهونەڤایتی" کە بە پەهلەوی "ئەهودگات"ی پێ ئەڵێن، بریتییە لە هەڵبەستێ، بە کێشی شانزە بڕگەیی (٧ بە ٩).

٢- بەشی "ئوشتەڤایتی" کە بە پەهلەوی "ئەشتودەکات"ی پێ ئەڵێن، بریتییە لە هەڵبەستێ بە پێنج "ها=فعل" بە کێشی یانزە بڕگەیی (٤ بە ٧).

٣- بەشی "سپەنتامینیو" بە پەهلەوی "سپەنتەدکات"ی پێ دەڵێن، کە "گیانی پیرۆز"ەو بریتییە لە هەڵبەستێ بە چوار "ها=فعل" ئەویش هەر یەکێ یانزە بڕگەییە (٤ بە ٧).

٤- بەشی "ڤوهوخشاترا"، کە بریتییە لە هەڵبەستێ کە یەک (ها=فعل)یو، لەسەر قافیەی سێ دێڕی دانراوە، بە کێشی چواردە بڕگەیی (٧ بە ٧).

٥- بەشی "ڤاهیشتوهیشتای" بریتییە لە هەڵبەستێ کە بە حەوت (ها) بەشێکی نۆزدە بڕگەییە (٧ بە ٧ بە ٥).

وەکو ئەبینین لەم پێنج بەشەی "گاتەکان"دا کێشی هەڵبەست، یانزە، دوانزە، سیانزە، چواردە، شانزە، نۆزدە بڕگەییە، بەڵام بە ناوی "بەشتەکانی"ەوە، لە ناویستادا پارچەیەکی تر هەیە وەک

کتێبی دوعاو ::صەڵەواتی زەردەشت وایە ، لەوەدا بەشی زۆری کێشی هەڵبەستەکانی هەشت بڕگەییە، ناو بە ناو کێشی (١٠) بڕگەیی‌و دوانزە بڕگەیشییان تیا ئەبینرێ لە هەشتییەکانا شوێن پشوو زۆرتر ئەکەوێتە ناوەڕاست (٤ بە ٤)، هەندێ جاریش ئەکەوێتە پاش بڕگەی سێهەم، یان پێنجەم، بە دەگمەن دوای بڕگەی دوەمیش ئەکەوێت.

لە هەڵبەستە دەیەکانا شوێن پشووی تاوێک ئەکەوێتە ناوەڕاست (٥ بە ٥)، تاوێکیش ئەکەوێتە پاش بڕگەی شەشەم (٦ بە ٤)، بەڵام هەڵبەستە دوانزە بڕگەییەکان دوو شوێنی پشوویان تیایە، یەکەم: پشوو پاش بڕگەی سێ، یان چوار یان پێنج ئەکەوێ. دووەم: ئەکەوێتە پاش بڕگەی هەشتەم.

لە هەڵبەستی ئاڤێستاییدا بەو پێیەی شارەزاکان ساغیان کردۆتەوە، بنەڕەتی کێش لەسەر چوونیەکی ژمارەی بڕگەن، جگە لەوە لە هەموو دێرە هەڵبەستێکیشا ناوبەناو شوێنی وەستان (پشوودان) بووەو بوێژ ئازاد بووە بە پێی سەلیقەی خۆی ئەم شوێنانە بگۆڕێت.



لە وێژەی زمانی پەهلەویدا، ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ (کریستنسن) ئەڵێ: ئەو کەسەی بۆ یەکەمجار هەستی بە هەبوونی هۆنراوە کرد (ئاندریاس) بوو، ئەم زانایە لە بەردە نووسەکانی "شاپووری یەکەم"دا لە "حاجی ئابار-ئێران" توانی پەی (ادراک) بەرێ بەوەی کە ئەم یادگارەی زمانی پەهلەوی سەردەمی ساسانییەکان هۆنراوەیەکی هەشت بڕگەیی یان حەوت‌و تەنانەت جێگای لەنگەری ناو ڕیزە هەڵبەستەکانیشی نیشانە کراوە، جگە لەم بەردنووسەی حاجی ئابار لەناو دۆزراوەکانی "تورخان"یشدا لە تورکستانی ئاسیای ناوەڕاست ژمارەیەک لە کتێب‌و نووسینەکانی "مانییەکان" کەوتە دەستی زاناکانی ڕۆژهەڵاتناس، لەناو ئەم نووسینەدا گەلێ سرودو پارچە هەڵبەست کەوتە دەست.

هەرچی بەردنووسی حاجی ئابار بوو بە ئەلفوبێی پەهلەوی نووسرابوو، کە پیتی بزوێنەری نییە. لە بەرئەوەش خوێندنەوەی دروست‌و تەواو بەم ئەلفوبێیە زۆر گرانە، بەڵام پاش جێماوی "مانییەکان" بە ئەلفوبێی ئاسووری نووسراوەو جۆری ئاخاوتنی بنجی وشەکان گەلێ باشتر ئەدا بە دەستەوە، ڕێکەوتی ئەم دۆزینەوەیە هەلی خۆش کرد بۆ پسپۆرەکانی پەهلەویناس کە ئاسانتر بتوانن لە بنج‌و بناوانی هەڵبەستی ئەم زمانە بکۆڵنەوە.

زانای فەرەنسی "بەنڤینیست" لە هەمووان زیاتر تێکۆشابوو بۆ ساغکردنەوەی هەڵبەستی پەهلەوی‌و لێکۆڵینەوە لە چۆنێتی ڕێکخستن. ئەم زانایە بۆ یەکەمجار لە دانراوی "ئاسوورێک"ەوە دەستی کرد بە ئیشکردن، ئەمە نامەیەکی پەهلەوییە وا دەرئەکەوێ، کە لە بنەڕەتا بە پەهلەوی ئیشکانی "پارسی"یەکان نوسراوە، بەڵام لە

پاشا لە سەردەمی ساسانییەکان دەستکاریو دانە دەمێکی بەسەرا هاتووە.
"بەنڤینیست" لە ناونیشانی نامەکەو لەم وانەی کە بە دەم بزووینەوە زوو زوو دووبارە ئەبێتەوە:
"ئیوم ئەپەرتە هەچ تو درەفت ئاسوریک"
بە کوردی یانی
"هەم بەرتر لە تو درەفتی ئاسووری"
لەمەوە باوەڕی بۆ ئەوە چووە کە ئەم نامەیە سەرتاپا هەڵبەست بێ، ئەمجا لە سەرەتا بەسەر ژمارەیەک دێڕە هەڵبەستی پانزە برگەییدا، بەڵام ئەمەی کاتێک هەیە بە پێی دەستوورو پێوانەکانی زانستیی زمانناسی هەموو لە "مەتنی مەحتەوی" بنجی دەر هاوێشت، ئاشکرایە بە ڕەنجێکی زۆرو بەم ڕەنگە بنەڕەتییە ئەشکانییەکەی (پارسی) لە وێنەی هەڵبەستێکی درێژا ساغی کردۆتەوە.
لە پاش دوو ساڵ هەمان ڕێباز لە نامەیەکی تری پەهلەویدا بەکارهێناوە بە ناوی "ئەیاتکار زەریران" یادگاری پاڵەوانەکان، نامەی سێهەم کە هەمان دەستوری ساغ کردەوە "جاماس نامگ" بوو.
لە "ئایاتکار زەریران"دا ئەم دوو دێڕە هەڵبەستەی لای خوارەوەش وەکو دێڕە هەڵبەستەکەی "درەفت ئاسووریک" لەسەر کێشی پانزە برگەیی دانراوە، کە بە دەم زروان خواکەلەی زەمانەوە ئەوترێ:
زەمان توزو مەندترە هەچ هەردو زەمان هەنداچک ئو کاری دانستان زەمان ئەندازەی بێ بنکەی گشت شتانە.
جگە لەم کێشە لە هەڵبەستە (مانەوییەکان)ی (تورفانا) کێشی: (٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠) برگەییش هەیە، ئەو کێشە (عەروز)یە دائەنێن کە فیردەوسی "شاهنامە"ی پێ هۆنیوەتەوە، کە دەریای موتەقاربی هەشتی مقصورە "فعلن، فعلون، فعلون، فعول". هەر وا "بەنڤینیست" لە پێناوی بەراوردی کێشی هەڵبەستی زمانە کۆنەکانا لەگەڵ "فۆلکلۆری" فارسی تازە بەم جۆرەی لای خوارەوە سەری قسەی سەرنجەکانی ئەکەیەنێتەوە بە زمانی کوردیش:
ئەگەرچی بە نەریتی (عادەتی) ڕاهاتنی کۆن لە ڕیزە پێوەگرتنی ژماردنا شێوە زمانە کوردییەکان لەگەڵ شێوە زمانی فارسیدا دابنێن، بەڵام بە روونی بۆمان ساغ ئەکاتەوە، کە کێشی هەڵبەستی کوردی لە جۆری برگەییەو ژمێرە (حساب)ی درێژیو کورتی برگە هیچ پەیوەندییەکی بە سەرەوە نییە.
"بەنڤینیست" ئەڵێ: "یادگاری زەریران" هەروەکو لە مێژووی وێژەی ئێرانیدا هۆی پێکەوە بەستنە بە سەردەمی (ئاڤێستا)و سەردەمی "دەقیقیو فیردەوسی"یە، لە باری سەرنجی ڕێبازی هۆنینەوەشەوە سنووری نیشان کردوە لە ناوەندی کێشی هەڵبەستی "ئاوێستایی" ناونیشانی بنجی (اصلی) گرنگیی ئەم سێ جۆرە کێشەو "ئاوێستای پەهلەوی فارسی گەل" ئەوەیە، کە هەرسێکیان لەسەر بنەڕەتی ژمارەی برگە دامەزراونو چەندیو چۆنی برگە لەمانەدا دەستی نییە.

هەروەها لە هەڵبەستی شێوە زمانەکانی کوردیو گۆرانیو هەورامانیو خوراسانیدا چەندیو چۆنی برگە هیچ کارێکی بەسەر کێشەوە نییە، لەبارەی قافییەوە شیاوی سەرنجە کە "بەنڤینیست" ئەڵێ:

لە هەردوو نموونەی هەڵبەستەکانی سەرەوەدا "یادگاری زەریران"و پارچە هەڵبەستەکانی یەکەمو سێهەم هاوقافیەن، هەروەکو دووەمو چوارەمیش پێکەوە هاوقافیەن، بەڵام دێری پێنجەم قافییەیەکی جیاوازی هەیە.

**ئەو کێشە برگەییانەی کە تا ئێستا باون**

لە پێشەوە وتمان لە فۆلکلۆری کوردیدا کێشی هەرەباو کێشی "١٠" برگەییە (٥ بە ٥) و وێنەمان لە هەڵبەستەکانی مەولەوی بۆ هێنایەوە، لە پاش کێشی دەیی لە فۆلکلۆردا کێشی هەشتی (٤ بە ٤) دێت، دوای ئەویش کێشی حەوتی (٤ بە ٣) لە تاکە تاکەی دێرەکانی هەڵبەستی لاوکو حەیرانیشا ئەتوانین کێشی یانزە برگەیی (٦ بە ٥)و (٤ بە ٤ بە ٣) بدۆزینەوە، بویێژە تازەکانمان لە ماوەی ئەم دە ساڵانەی دواییدا لە بەرهەمی هونەریانا ئەم جۆرە کێشانەیان هەموو ژیاندۆتەوە، جگە لەوەش چی بە چاولێکەری بێگانەو چ بە رێگای داهێنانەوە چەند جۆرێکی تازەی کێشیان دۆزیوەتەوە، ئەوە لای خوارەوە یەکە یەکە لەو جۆرە کێشە برگەییانە ئەدوێین: کە لە شێوەی سۆرانیدا تا ئێستا هەڵبەستیان پێ دانراوە:

١- کێشی دە برگەیی، ئەم کێشە لە هەڵبەستی کوردیدا ئەوەندە باوە پیاو زۆر بە ئاسانی ئەتوانێ ناوی لێ بنێ کێشی نەتەوەیی گەلی کورد، هەر بەو دەستورەی لە زمانی فەرەنسزیدا کێشی دوانزە برگەیی "ئەسکەندەری" بە کێشی نەتەوەیی دائەنرێ بۆ گەلی فەرەنسەیی، یان کێشی "ئیامبیک" بە کێشی نەتەوەیی دائەنرێ بۆ ئینگلیزەکان، یاخود کێشی یانزە برگەیی (٦ بە ٥) بۆ تورکەکان.

لە ناو هەموو کۆڕەکانی ژنو پیاوا کێشی هەڵبەست نییە ئەوەندەی ئەم کێشی "دەیی"ە بەسەر دەمەوە بێو لە هەڵبەستەکانی چیرۆکو گۆرانیو شیوەنو بەستەو لایەلایەی کوردیدا بە زۆری بەکاردێنو بۆ دانەرەکان بە ئاسانی رێک دەخرێت ، تیرە هەڵبەستەکانی کێشی دەیی بە ئاسانی (عادەتی) هەریەکێ لە دوو پێی پێنج برگەیی دروست ئەبن، بەڵام دروستیشە دێری هەڵبەستی لە سێ پێی پێنج برگەیی بهۆنرێتەوەو تاوەکو وێنەی لای خوارەوە:

مەلی سەر پنچک پەل و پۆ بۆ رەنگین خۆ من هەڵۆ نیم
لێم مەفرن بە جووت مەترسن ئاخر پێتان بڵێم چیم
منیش وەک ئێوە لەم دنیا گەورە کەردێکم بچووک
ناشتوانم بۆ خۆم بفرم بخوێنم بە باڵ بە دەنووک

٢- کێشی هەشت برگەیی: کێشی هەشت برگەیی لە فۆلکلۆری کوردیدا زۆر باوە، واش دێتە بەرچاو هەتا بەرەو ناوچەی شێوەی کرمانجی بڕۆین باوی زۆرترە بە پێچەوانەی دە برگەییەوە، کە تافی برەوی (شدە الرواج) لە جەرگەی ناوچەی شێوەی گۆرانییەوە دەست پێ ئەکا، دێری هەڵبەستی ئەم کێشە لەسەر دوو پێی چوار برگەیی ئەڕوا، زۆربەی بەرهەمی بویێژە تازەکانمان بەم کێشەو بەم جۆرە هۆنراوەتەوە، ئەم پارچەیەی لای خوارەوە وێنەی جۆری ساکاری کێشی هەشت برگەیی (٤ بە ٤)ە:

وەنەوشەی بن درک خزاو
نێرگزە جار بە هەزار چاو
چاوی رەشی کردەوە دی
پێنەکەنێ زەردو سپی

٣- کێشی حەوت برگەیی: لە فۆلکلۆری کوردیدا کێشی حەوت برگەیی (٤ بە ٣) لە پاش هی هەشتی دێ، لەبەر نزیکیی مۆسیقاکەی لە کێشی هەشتی لە هەڵبەستی فۆلکلۆریدا هەندێ جار تاکە تاکە لە ناو دێرە هەڵبەستەکانی هەشتیدا بەرچاو ئەکەوێ، لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەیەکی زۆر هەڵبەستی تازەی پێ دانراوە ئەم پارچەی لای خوارەوە نموونەیەتی:

هەرچەند کە ئەیدی ناوا
کەشتی بۆ گەرداو ئەڕوا
هەزاران هاوار بکرێ
کەس نییە ڕێی ڕاست بگرێ
ناچار خۆی سەرخۆش ئەکرد
هەستی فەرامۆش ئەکرد
جارجار کە زۆر پەست ئەبوو
کەمێکیش بەدمەست ئەبوو
بە جوێن، توانج، سەرزەنشت
داخی دڵی خۆی ئەڕشت

سەرچاوە : یەکێک لە وانەکانییەتی کە لە کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدا

# بۆ مەرگی گۆران

ئازاد (سوارەی ئیلخانیزادە)

بۆکان - ڕەشەمەی ٢٥٧٤ی کوردی [١٩٦٣ی زایینی، ١٣٤١ی هەتاوی]

نیتر لەسەر لێوی بەیان، زەردەخەنەی ڕۆژ نابینین
نیتر لە بێشکەی خەیاڵا، کۆرپەی ئاواتمان نانوێنین
ئیتر "دەنگی نزمی عوودێ" لە "جەرگی پەردە" ناتکێ!
نیتر "تریفەی مانگەشەو"، بە ناخی دڵا نالکێ!
لە جێی "جریوەی دارستان" ناڵەی دڵی کۆست کەوتووە
گۆران خودای شیعری کوردی، لە خاکی ڕەشا خەوتووە!
بە "شنەی سێبەری داری توو"، "عارەقی ماندوویی ئەسرین"
بەڵام کوڵی دڵی زامار، چاومان پڕ ئەکا لە ئەسرین!
ئیتر نە "ئەستێرەی بەیان"، نە "نەغمەی فریشتەی ئەلحان"
ناتوانێ جەرگی هەڵقرچاو، پڕ کا لە "هەستی سپی و جوان"!
نە ڕەوتی بیر بزوێنی کەو، نە "کەروێشکی گورج و قەڵەو"
نە سرتەی دڵدار و دڵبەر، نە سروەی خەیاڵاویی شەو
نە "باڵداریکی ئێسک سووک"، نە "شایی" پیرۆزی نۆبووک
نە بزەی بێرەنگی نازیز، نە دیمەنی گەشی گڵووک
ئیتر هیچیان سپی ناکەن، "کوێن"ی ماتەمی ژینی ڕەش
"کارەبای نۆخە"و نارەزوو "ناخەنە بانی ڕەگی لەش"
"شەپۆلی دەریای بێ سنوور" لە داوێنی بەستێنا مرد!
مۆنجی پەژارە و پەرۆشی قەڵای پڕ هیوای دڵی برد!

خودات لەگەڵ بێ ئەی گۆران! ئەی خودای هەڵبەستی کوردی!
ئەوجار لە دڵمانا زیندووی ئەگەر لەبەر چاومان مردی!
تۆ عاشقی جوانییێک بووی کە شاردراوەو نادیاری بێ
مەفتونی ئەو دونیایە بووی کە پڕ لە سەفاو یاری بێ!
بەڵام ئەو دونیا ڕووناکە، بەو هەستە خاوێن و پاکە!
لە فیکری تۆدا خۆی دەنواند، نەک لەسەر ئەو زەوی و خاکە!
حەیف! ئەمای و تەماشا کەی، کوردستان چەند جوان و خۆشە!
ئێستا لە بن "توترکی" سوور "وەنەوشە بۆ تۆ پەرۆشە"!
ئەوسا کێ بە "سیحری نەغمە" لەگەڵ ڕۆحم سکاڵا کا؟!
وشکارووی سووتاوی زەوقم، پڕ گوڵی ئاڵ و واڵا کا!
کێ بە زمانی ئاشنای دڵ باش لەگەڵ گیانم بدوێ؟!
خۆزگا! گوڵی ڕەشی نیسیان لە سەحرای ژیانم بڕوێ!
کاتێ کۆچی زەوق و هونەر لە کێوی ژیان ناوا بوو!
بەهەشتی کوردستان چۆڵ بوو، بەهەشتی خودا ناوا بوو!

سەرچاوە:
- حەوتەنامەی "کوردستان"
- خاوەنی ئیمتیاز و مودیری لێپرسراو: عبدالحمید بدیع‌الزمانی
- سەرنووسەر: دوکتور محمدڵدیق مفتی زادە
- ژمارەی ٤٣ - ساڵی چوارەم - ژمارەی شوێن یەک ١٩٧
- چوارشەمە - ٧ ڕەشەمە - ٢٥٧٤ ک، ٨ ئەسفەند - ١٣٤١ ش - ٢ شەوال ١٣٨٢ ق - ٢٧ فوریە ١٩٦٣م
- لاپەرە ٤
- چاپی تاران

# بیرت ئەکەین

شێرکۆ بێکەس

کاتێ پەپوولەی تەماشام باڵەفڕێی لەناو باخی ،
وشەی ڕەنگاوڕەنگا نەکرد
لەسەر چڵی درەختی دێڕ . . لێوی تاسە و . .
دەمی چاوی
بۆ کوڵمی هۆنراوە نەبرد . .
کاتێ . . تازە ، خامەی کۆرپەی زمان گرتووم ،
ناسوی بیری چاو پشکوتوم ،
لەناو تریفەی خەیاڵا . .
لەناو لانکەی دەسرازە شینی . . ساماڵا ،
پیلووی حەزی بۆ جریوەی ئەستێرەی بەهرە
نەترووکان
کاتێ . . تازە . بە ڕستەی پەلکەزێڕینەم
پرچی کیژی . . پیتەکانم . . نەهۆنیوە
موورووم . . لە ناونگی بەیان ،
لە تەرزەی فرمێسکی سپی ، پەریی ئاسمان
بۆ ملوانکەی گەردنی ئەو . . . ،
لەسەر پەڕەی نێرگزی خۆر . . نەچنیوە
کاتێ . . تازە ، شەپۆلی ناو لەرەی دەنگم . .
باوەشی نەکرد بە ڕۆخی تینووی گیانا
مەلی هەناسەی تەریوم و یڵ بوو بە - دووری -
لق و پۆپی درەختێکی نوێی ژیانی . .

کۆتری چاوم . . هەڵفڕی
پەپوولەی تەماشام . . گەڕا ،
گەڕا . . گەڕا
باخی وشەی ناو دیوانی گەلێ بڕی
بە سێبەر و هەتاوی ناو وەرزی دڵی
گەلێ . . شاعیرا تێپەڕێ
بەڵام هیچیان بە نەرمەبای خۆشەویستیی
فرمێسکی پشکۆی دەروونی . . نەمیان نەسڕی
هیچیان . . شەوی ، ناو بێشکەی تەنیایی
ژووری نەمیان . . ڕانەژەنی
هیچیان . . لە پرشنگی شەبەق . . گوڵێکی نوێی
نەبینراویان . . بۆ نەچنی . .
هیچیان . . لەناو گرمەی هەوری وشەی کوردا
دەنگێکی تریان . . بە گوێچکەی ،
ئەو . . نەناسی !
هیچیان بە ڕەنگی تازەتر . . وێنەیەکیان
بە ژووری چاو و سەرنجیا ، هەڵ نەواسی ، . .
تا گەیشتە . . ئەو بەهەشتەی لە کەژاوەی
بەر تاقگەی یادگارا
گوڵی وشەی نوێی هەڵبەستی ،
نەکرد بە قژی بەهارا . .

تاگەیشتە . . ناو ئەو خەوە ڕەنگاوڕەنگەی
سروشت بە شانەی سەوزە گیا
بە پرشنگی بریسکەی سەر بەفری چیا ،
سەری کچی ، هۆنراوەی نوێی ، دانەهێنا
تاگەیشتە . . ئەو فرمێسکەی لەناو پێلووی
- ناوازی ماتی هونەرا -
بە شوێن بزەی هەتاوی ڕووی
وشەی سەربەستا . . نەگەڕا
تاگەیشتە . . لای ناهەنگی ئەو دەنگانەی :
کە نابیسرێن . .
تاگەیشتە . . لای گوڵزاری ئەو ڕەنگانەی
کە نابینرێن . .
تاگەیشتە سەر ڕوانگەی چاوی - گۆران -
چاوی وشە ، چاوی ژیان .

بیرت نەکەین . . لەگەڵ فرمێسکی لاوکی
چاوی شمشاڵی ( دەروێشا ) . . بیرت نەکەین
یادت نەکەین . . لەگەڵ هاواری خوێنی ناو :
تۆڵەی گەرووی هەڵۆبەگا . . یادت نەکەین
لەگەڵ ( پەپوولەی نیازی گفت و گۆی ) . .
سەر لێوی قژ زەردی شۆخا . .
تاسەت نەکەین . .
لەگەڵ بۆی مەمکی ناو درزی ،
سوخمەی نازداری گوڵ ڕەنگا ،
لەگەڵ ( بووکی تانجەڕۆی ناو ،
دۆشەکی سەوزی ) سروشتا . . بیرت نەکەین

لەگەڵ ( ماسی ڕۆحی ) چاوی
بنی گۆمی مەنگ و شینا . .
لەگەڵ هێرۆی سەرلق ناڵی
زاڵ بەسەر درکی زەمینا ، یادت نەکەین
لەگەڵ دەنگی ( کنالەیل ) و دارو بەردی
هەوراما نا . .
لەگەڵ ( بەفری بەر هەتاو و ) نورکسترای
مۆسکۆی جوانا . .
بەیەکەوە . . لەگەڵ گازی کەلەبچەی دەستی
سەربەستی
ڕێی . . زیندانا
بەیەکەوە . . لەگەڵ گڕی هەزار ساڵەی
سەرکێوانا . .
بەیەکەوە لەگەڵ کانی بەر تریفەی
مانگەشەوی هاوینانا . . تاسەت نەکەین
بەیەکەوە . . لەگەڵ پەریی . . قژ پەشێوی
ژوور سەری گۆڕی بێ کەسا . .
یادت نەکەین . . تاسەت نەکەین . . بیرت
نەکەین .

× ئەم شیعرە لەو کۆڕەدا خوێنرایەوە ، کە یەکێتیی نووسەرانی کورد لە بەغدا ، پێکی هێنابوو ، بۆ یاد و بیرەوەری شاعیری نەمر ( گۆران ) .

# الى عبدالله گوران

عبدالوهاب البياتي

الثلج في جبال كردستان
يذوب
الربيع في الوديان
والكلمات ملح خبز الحب والاغان
يمد منها الف جسر عبر ليل الموت والفقدان
يزهر في حروفها بستان
يذيب في لهيبها المسوخ فجر الكادح الفنان
يولد شعب ،يولد الانسان
فلتصعدي القمة يا عروسة الشعر ويا قوافي الاحزان
ولتعبري البحار والازمان
ولتدركي الفجر الذي يطلع في جبال كردستان
هناك في القمة حيث الثلج و النيران
هناك عرى صدره للشمس والعقبان
شاعرنا گوران
من اجل ان يولد شعب يولد الانسان

من ديوان (النار و الكلمات )

